# لە ڕێی جیاییەوە بۆ ڕاجیایی

(٩٣) یاسا و بنەما بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕاجیایی (ئیختیلاف) و
موخالیفەکان و زانایان و مەزاهیب و توراس و کەلەپووردا

نووسینی

صلاح الدين أحمد

# ئەم پەرتوکە پێشکەش بێت بە

- هەموو شەیدانی حەق و حەقیقەت
- هەموو ئەوانەی دەیانەوێت دووربکەونەوە لە شتە بچووکەکان (جوزئی و فەرعییەکان) و کۆببنەوە لەسەر بنەما و هێڵە گشتییەکان (ئەسڵ و کولییەکان)
- هەموو ئەوانەی ڕاجیایی و ئیختیلاف تەنها لە عەقڵدا دەهێڵنەوە و نایبەن بۆ دڵ
- هەموو ئەوانەی لە ڕێ جیاییەوە دەچن بەرەو ڕاجیایی
- هەموو ئەوانەی خەمی ئیسلام و موسڵمانان و ئوممەت پێش خەمی خۆیان و بەرژەوەندییە کەسییەکانیان دەخەن
- باوك و دایکم کە زۆر پێمەوە ماندووبوون
- هاوسەری ئازیزم کە زۆر پاڵپشت و پشتیوانمە
- برا و خوشکەکانم
- کوڕە شیرینەکەم (نامی)، کچە شیرینەکەم (نور)
- هەموو مامۆستا و قوتابیانم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ڕاجیایی ئاساییە، بەڵام ڕێ جیایی نا، ڕاجیایی ئاساییە، بەڵام دوژمنایەتی یەکتر کردن و ڕق و بوغز و کینە و دژایەتی یەکتر کردن و .... نائاساییە، دەکرێ ڕاجیا بین، بەڵام لە هەمان کاتدا برا و پشتیوان و خۆشەویست و ... یەکتر بین، بۆیە با لە ڕێ جیاییەوە بچین بەرەو ڕاجیایی، لە جیاوازی دڵەکان بچین بەرەو جیاوازی عەقڵ و فیکرەکان، چونکە ئاساییە بیرکردنەوەکانمان جیاواز بن، بەڵام ئاسایی نییە دڵەکان ناکۆك و دژ بەیەك بن.

ئوممەتی ئیسلام دەناڵێنێت بەدەست دەیان و سەدان نەخۆشی و دەردەوە کە هەرکێکیان هۆکار و پاڵنەری خۆی لە پشتەوەیە، هۆکارەکان بەشێکیان دەرەکین و بەشێکیان ناوەکی و ناخۆیی، دیارە بۆ چارەسەر و هەستانەوەش پێویستیمان بە دەیان و سەدان بنەما و یاسا و ڕێنمایی و ئامڕاز و هۆکار هەیە بۆ ئەوەی ئەم ئوممەتە بێتەوە سەر ڕێ و ڕاستە ڕێ ببێت، لای هەموان زانراوە کە ئەم ئوممەتە خاوەن گەورەترین و باشترین و جوانترین شارستانیەت بووە، کەواتە داڕووخانی و دواکەوتنی و کەوتنی جێی هەڵوێستەکردنە بۆ یار و نەیار، هەربۆیە هەستاین بە نووسینی ئەم کتێبە بۆ چارەسەر و ڕاستبوونەوە و ڕاستەڕێ بوون و مامەڵەی جوان لەگەڵ ڕاجیایی و جیاوازییەکاندا.

گریانی دەوێ لە سەردەمی شەڕی (کلیات) و شتە گەورە و گرنگەکاندا، ئێمە خەریکی (جزئیات) و شتە لاوەکی و بچووك و جوزئییەکان بین، ئێمە خەریکە ئەخلاق و ئیمان و فکر و .... دادەڕووخێ و ژێر زەویی و سەرزەوییان دزین و بەتاڵانیان برد، بەڵام تازەبەتازە خەریکی شتی بچووك و لاوەکی و جوزئین کە یەکلانەبوونەوە و یەکلاش نابنەوە و ئاساییشە یەکلا نەبنەوە، چونکە خۆیان وا هاتوون کە تەفسیر و ڕاڤەی جیاجیا هەڵبگرن ... !

دەیان پرسی وەك ئیلحاد و هاوڕەگەزبازی و جێندەر و فێمێنیزم و بێ مەبدەئی کردن و لەناوبردنی شوناس و هەڵتەکاندنی ئەخلاق و فیترەت و بێکاری و فەقیری و هەژاری و گرانی و تەڵاق و کوشتن و خۆکوشتن و زینا و لەشفرۆشی و ماددەی هۆشبەر و زۆربوونی قەیرە و کەمبوونەوەی زەواج و نەمانی پەروەردە و لەدەست دەرچوونی منداڵ و هەرزەکار و گەنج و نەخۆشی دەروونی و فیکری و گەندەڵی و پوچگەرایی و لەناوبردنی ئاوات و ئامانج و تواناکانی گەنج و ....

هەتا خەریکی شتی بچووك بین هەرگیز ناپڕژێینە سەر شتی گەورە.

دوژمنان خەریکن شتە گەورە و گرنگەکانمان داڕووخێنن و بیانبەن، ئێمەش خەریکی شتی بچووك و جوزئی بکەن، بۆ ئەوەی نەپڕژێنە سەریان و لەبیریان بکەین.

خۆزگە بە وردی لە شەڕە گەورەکان تێگەیشتباین کە بەرامبەرمان دەکرێت، بۆئەوەی وازمان لە شەڕە بچووکەکانمان هێنابا.

شایەنی باسە بەشێکی ئەم گەڕەلاوژێیە دەگەڕێتەوە بۆ قسەکردن و تەداخولی خەڵکی نەشارەزا لە بابەتە زانستیەکاندا، هیچ سەردەمێك بە ئەندازەی ئێستا موفتی و قسەکەر لە دیندا زۆر نەبووە! جاران بەس زانایان جورئەتی قسەکردنیان لە دیندا هەبوو، ئەویش ئەگەر لەو زاناتر وجودی نەبایە لە مەجلیسەکەدا، ئەگەر لەو زاناتر هەبوایە، یان مامۆستاکەی وجودی بووبا، جورئەتی نەدەکرد نەك فەتوا بدات، بەڵکو قسەش بکات، یان زۆرێك لە مامۆستایان کە مامۆستاکەیان لە ژیاندابایەت جورئەتیان نەدەکرد خۆیان ئیجازە بدەن بە قوتابی و فەقێ کانیان، یان ئەگەر مامۆستاکەیان لەوێ نەبایە، نەدەچوونە شوێنی میحرابەکە نوێژ بکەن، بەڵکو تۆزێ دەهاتنە ئەو لاوەی میحرابەکە، بۆ ئەوەی نەچنە شوێنی مامۆستاکەیان، یان دەیان مەشهەد و وێنەی بەرز و جوانی دیکە کە پڕن لە ڕێز و قەدر و خۆشەویستی و ...

پێم سەیرە خەڵکێك بێ هیچ بنەمایەکی عیلمی و مەنهەجی و ... دەستیان داوەتە فەتوا و قسە کردن لەسەر پرسە گرینگ و گەورەکانی دین، بێ ئەوەی پلەکانی زانست و مەنهەجی زانستییان بڕیبێت ...!

هەر کەسێ شارەزای زانستە ئیسلامی و شەرعییەکان بێت دەزانێت کە بەلایەنی کەم پێویستی بە دەیان ساڵ لە چۆك دادان و

قوربانیدان و خوێندنەوە و لەبەرکردن و دیراسەکردن و توێژینەوە و .... هەیە، تا بتوانێت لەسەر ئەم پرسە گەورانە قسە بکات و لایەك بەلایەکدا بدات.

هەر کەسێ شارەزای زانستی (أصول الفقه) بێت، دەزانێت کە قسەکردن لە دیندا و فەتوا و ئیجتیهاد مەرج و شەرتی قورسی هەیە و وا ئاسان نییە. بۆیە ئەو گێژاو و گەڕەلاوژێیە و بێ سەروبەرەییە غەیری جەهل و نەزانی لە هیچی ترەوە سەرچاوەی نەگرتووە

هیچ بابەتێك نییە جگە لە دین خەڵك وا بە ئاسانی بتوانێت لە بارەیەوە بدوێ و بەکەیفی خۆی شتەکان یەکلایی بکاتەوە! بڕۆ بزانە کەس دەتوانێت بێ شارەزایی و ئیختیساس لە بارەی پزیشکی و ئەندازیاری و فیزیا و ... بدوێ؟!

بەس دینە وا بێ ساحێب بووە، هەرکەسێ دوو کەلیمەی خوێندەوە و دوو ئایەت و فەرموودەی لەبەرکرد دێت ڕاست و چەپ بەناو دەکەوێت! بێ ئەوەی ئەولا ئەملای بابەتەکەی لێ دیاربێت، بێ ئەوەی بناغەیەکی قوڵی زانستی هەبێت، بێ ئەوەی .....!

ئەوەی لە هەمووی جێی داخترە ئەم شەهادە و بڕوانامە بێ ناوەڕۆکانەیە، بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا و (هەندێ) لە ئیجازەی مەلایەتی و ....

مەرج نییە ئەوەی بڕوانامەی بەرزی لە شەریعە هەبوو یان ئیجازەی مەلایەتی هەبوو لێیان ببێ بە موفتی و قازی و زانا و

موجتەهید و عەللامە، نەك مەرج نییە، بەڵكو زۆربەی ئەو ئاستەی نییە هەر قسەشی تێدا بكات! قەینا با ئیرشاد و ئامۆژگاری و دەعوە و بانگەواز بكات، بەڵام دەبێ ئاست و موستەوای خۆی لەبەر چاو بێت و خۆی بناسێت، چونكە ئەوەی توانای خۆناسینی نەبێت، چۆن توانای خواناسین و خوا بەخەڵك ناساندنی دەبێت؟!

پێویستە بانگخوازەكانیشمان، یان ئەوانەی بەس ئاستی دەعوە و بانگەواز و ئیرشاد و ئامۆژگارییان هەیە نەبنە موفتی و قازی و زانا و موجتەهید و لێگەڕێن بۆ كەسانی موختەس و شارەزا، چونكە زۆربەی ئەوانەی ئێستا بوونە دەمڕاست و قسەكەری دینی تەنها حەقی دەعوە و بانگەواز و ئامۆژگارییان هەیە، نەك فەتوا و ئیجتیهاد و یەكلایی كردنەوەی ڕاجیایی لەسەرەكان و پرسە گەورە و گرینگەكان، چونكە ئەم بابەتانە هەروا ئاسان نیین، هەربۆیە هەندێ لە زانایان لەسەرەمەرگدا گریاون بۆ ئەو فەتوایانەی كە داویانە!

بەداخەوە قسەكردن لە دیندا و خۆنواندن وەك مەلا و زانا و بانگخواز و .... بووە بە جۆرێك لە فەخر لێدان و شانازی بەخۆوەكردن، بێئاگا لەوەی ئەمە هەموو بەرپرسیارییەتیە و ئەمانەتێكی قیامەتی گەورەیە و هەمووی حیساب و كیتابی لەسەرە، چونكە هەشمانە ئاستی ئەوەی هەیە قسە لە بابەتێكی شەرعیدا بكات، بەڵام مەرج نییە توانای هەبێت لە هەموو بابەتەكاندا بدوێت و فەتوا بدات.

لە کۆتاییدا زۆر پێویستە خەڵکیش جیاکاری بکات لە نێوان ڕۆشنبیر و خوێندەوار و ئیمام و وتاربێژ و قورئانخوێن و بانگخواز و ئامۆژگاریکار و زانا و موجتەهید و بیرمەند و ... چونکە ئەوانە زۆر لێك جیاوازن.

با لێ گەڕێین هەموو بابەتەکان کەسی زانا و دانا و دینبین و دونیابین و شارەزا لە بوارەکان بدوێن و خۆمان لە شتێ هەڵنەقورتێنین کە کاری ئێمە نییە.

**شایەنی باسە ڕاجیایی جاران لەگەڵ ئێستادا زۆری فەرقە:**

**١.** جاران موناقەشە و گفتووگۆی زانستی تەنها لەنێوان زانایاندا بوو، بەڵام ئێستا عەوام هاتۆتە مەیدان و لە باشترین حاڵەتدا موناقەشەکە لەنێوان بانگخوازاندایە نەوەك زانایان، هەر بۆیەشە سەرەنجامەکەی ئاوایە کە دەیبینین!

**٢.** جاران موناقەشە و گفتووگۆکان لەچوارچێوەی ئەدەب و ئەخلاقدا بوون، بەڵام ئێستا - لەزۆر حاڵەتدا - لەسەر نائەدەبی و نائەخلاقی دامەزراوە.

**٣.** جاران پێوەر بریتیبوو لە بەڵگەی زانستی و عیلمی، بەڵام ئێستا پێوەر بووە بە بەهێزی سۆشیال میدیا و پەیج و کۆمێنێت و لایك و سپۆنسەری و ... هتد.

**٤.** جاران وەڵامەکان لە دووتوێی کتێبەکاندا بوون، ئەوەی زانا و شارەزا نەبایە لە موناقەشەی نێو زانایان تێنەدەگەیشت، بەڵام ئێستا

وەڵامەکان لە کتێب و نووسین و دەرچووە و هاتۆتە ناو بازاڕ و سوشیال میدیا و خەڵکی عەوام، جاران کتێب بە کتێب وەڵام دەدرایەوە، بەڵام ئێستا ڤیدیۆ بە ڤیدیۆ، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی هاتنە ناوەوەی خەڵکی عەوام بۆ ناو گفتووگۆکان، دواتریش تەفرەقە و دووبەرەکی و تێکچوونی ئاسایشی کۆمەڵایەتی.

**٥.** جاران موسڵمانان دەوڵەتیان هەبوو، نیوەی جیهانیان لەبەردەستدا بوو، لەژێر سێبەری ئەو هێز و دەوڵەتەدا ئەو باردودۆخە دەگوزەرا، بەڵام ئێستا موسڵمانان لەو پەڕی بێهێزی و لاوازیدان و دەیان شتی زەرورتر هەیە پێوەی خەریك بن.

**٦.** جاران گفتووگۆکان یەك پارچەبوون لە بەڵگەداری، هەرچی دەیان نووسی بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی دەیان نووسی، بەڵام ئێستا - لەزۆر حاڵەتدا - بووە بە شەڕە جنێو و تەشهیر و ناوزڕاندن و بووختان!

**٧.** جاران موناقەشەکان - بەشێوازێکی گشتی - لەخەمخواردن بوو بۆ ئیسلام و داکۆکی کردن لێی، بەڵام ئێستا لە زۆر حاڵەتدا لەخەمخواردنە بۆ ناوبانگ و دەرکەوتن و خۆزاڵ کردن و قەرزدارکردنەوەی بەرامبەر بەبەکارهێنانی ئیسلام.

**٨.** جاران هەر لایەك ئامادەبوو لەپێناو باوەڕ و بۆچوونەکەی خۆیدا بەرپرسیارییێتی هەڵبگرێت و تەحەمولی ناڕەحەتی و زیندان و دەربەدەری بکات، بەلا ئێستا - زۆرجار - لەگەڵ هەبوونی نزمترین

ئاستی هەڕەشە سەیردەکەی سازش دەکات و پاشەکشە دەکات لەو بڕوایەی کە پێشتر زۆر لەسەری سور بووە و بەرامبەرەکەی لەسەر گومڕا دەکرد.

## چۆن مامەڵە لەگەڵ جیاوازی (ئیختیلاف) دا بکەین؟

**١.** پێش هەموو شتێ دەبێ ئەوە بزانین کە جیاوازی شتێکە خوای گەورە ڕێی پێداوە، ئەگەرنا دەیتوانی هەموو شتەکان ببڕێنێتەوە، یان هەموو کەسەکان لەسەر یەك بیرکردنەوە دروست بکات.

**٢.** پێغەمەر ( د.خ) ڕێی پێداوە، ئەگەرنا ئەویش هەڵدەستا بە ڕاڤەکردنی هەموو قورئان و شتەکانی هەموو دەبڕیەوە.

**٣.** جیاوازی یەکێکە لە شتە جوانەکان و ئەوەندەی جوانکەرە ئەوەندە ناشیرینکەر نیە.

**٤.** جیاوازی جیاوازە لە تەفرەقە و دووبەرەکی و دوژمنایەتی.

**٥.** نیەت پاکی، پێش هەموو شتێ دەبێ نیەتت پاك بکەیەوە بەرامبەر موخالیفەکانت.

**٦.** نابێ جیاوازی سنورەکانی ڕێز تێپەڕێنێت و بەرەو بێ ڕێزی بڕوات.

**٧.** نابێ ڕق و کینەی تێدابێت و سەربکێشێت بۆ ڕق و کینە.

**٨.** نابێ پێت وابێ حەق و ڕاستی بەس لای تۆیە.

**٩.** دەبێ بڕوات بەگۆڕانی (ئەحکامە جوزئی و گۆڕاوەکان) هەبێ بە گوڕانی کات و شوێن و باردۆخ و کەسەکان.

**١٠.** نابێ حوکم لەسەر کەسی بەرامبەر بدەی تاوەکو بەتەواوی لێی دڵنیا دەبی و هیچ گومانت لێی نامێنێت.

**١١.** نابێ بڕوات وابێ کە خەڵك دەبێ هەموو پەیوەست بێت بە کەسێك یان جەماعەتێك یان مەزهەب و ڕەوت و ڕێبازێك.

**١٢.** نابێ هەرگیز بیر لەوە بکەیەوە کە جیاوازیەکان نەهێڵی و کۆتاییان پێ بێنێ، بەڵکو دەبێ هەوڵی نەهێشتنی ڕق و کینە و دوبەرەکی بدەی، چونکە جیاوازی هەر هەبووە و هەر دەشمێنێت.

**١٣.** دەبێ بەتەواوی بڕوات بە جیاوازی هەبێ لە شتە فەرعیەکان و پێت وانەبێ شتێکی خراپن.

**١٤.** نابێ ئینکاری بکەی لەو شتانەی ئیختلاف و جیاوزییان تێدایە، دەکرێ هی خۆت پێ ڕاست بێت، بەڵام ناکرێ ئینکاری بکەی.

**١٥.** هەتا بکرێ لەناو خەڵکی عەوام ئەو بابەتانە نەوروژێندرێن.

**١٦.** شتێ کە زانستی تەواوت پێی نەبوو قسەی تێدا مەکە.

**١٧.** هەوڵی دۆزینەوەی خاڵە هاوبەشەکان بدەی نەك بەپێچەوانەوە.

**١٨.** جوزئیات و شتە فەرعیەکان بەلاوە بنێی و خەڵکی لەسەر موحاسەبە مەکە.

**١٩.** کاتێ زانایێك یان موجتەهیدێك هەڵەی کرد و نەیپێکا، نابی پێت وابێ ئەوە گوناهبار و لادەرە، نەخێر بەپێی فەرموودەی پێغەمەر ( د.خ) پاداشتیشی هەیە نەك گوناهبار بێت.

**٢٠.** نابێ خۆت تەڵقین بدەی بەوەی کە هەموو کاتێ موخالیفەکانت لەسەر هەڵەن، نەخێر دەکرێ بەپێچەوانەوە بێت.

**٢١.** نابێ وتەی کەسانی موخالیف و بەرامبەر بە خراپ ڕاڤە و لێکدانەوەی بۆ بکرێ، نەخێر بەڵکو هەتا دەکرێ جوان لێکدانەوەی بۆ بکرێت.

**٢٢.** دوور بکەوینەوە لە ناوزڕاندن و سوکایەتی پێکردن و ...

**٢٣.** چاکەی کەسی بەرامبەر و موخالیف لەبیر نەکەین.

**٢٤.** گومانی خراپ نەبەین.

**٢٥.** ڕەخنەگرتن لەبیر و ڕای کەسێ نابێ بە ڕەخنە لەکەسەکە لێك بدرێتەوە.

**٢٦.** هیچ کاتێ ئەوە لەبیر نەکەین کە پاراستنی برایەتی واجبە و نەپاراستنی سزای توندی لەسەرە.

**٢٧.** هەرکاتێ ناڕازی بووی لەبرا و خوشکەکەت و جیاواز بووی لێی، ئەوەندەی دەکرێ برۆ بەرەوڕوو کێشەکانی لەگەڵدا چارەسەر بکە و بە پاشەملە و ....، مەیڕوشێنە، چونکە دوایی هەم گوناهبار دەبی وە هەم لای ئەو کەسە ڕق لێداگیراو دەبی، هەمیش پەیامەکەت ناگات و بەگوێت ناکات.

### چەند تێبینییەك:

**١.** ئەو بنەماو چارەسەرانەی لەم کتێبەدا باسمانکردوون نەخەونن، نەخەیاڵ و نە بیرێکی میسالیی و نا واقیعی، بەڵکو هەمووی لەتوانای خۆماندایە، بەڵام دەمێنێتەوە سەر ئەوەی تا چەند جێبەجێیان دەکەین.

**٢.** ئەم نووسینە بەشێوازێکی کورت و پوخت و مەتن نوسراوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بخوێندرێتەوە و چاپ و بڵاوببێتەوە.

**٣.** کەمترین بەڵگەمان هێناوەتەوە بۆ ئەوەی نووسینەکە درێژ نەبێتەوە.

**٤.** مانای وا نییە بەس ئەوەی لەم کتێبەدا باسکراوە چارەسەرە، نەخێر، زۆر شتی تریشمان هەیە بەڵام ئەمانە هێڵە گشتییەکانن و دەتوانین بڵێین زۆرێك لە هۆکار و ئامرازەکانی تر لە ژێر ئەمانەدا جێیان دەبێتەوە. زانایان و نووسەرانیش شتی زۆریان نووسیوە لەم بوارەدا و ئێمەش سوودی زۆرمان لێ بینیون، خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

**صـلاح الـدین أحــمد**
**ڕانیە ٢٠٢٣/٩/١٤/**

## فیتری بوون و زگماکی بوونی جیاوازی و ڕاجیایی

جیاوازی شتێکی فیتریە و خودای گەورە مرۆڤەکانی بەم شێوەیە دروستکردووە، مرۆڤەکان جیاوازن لە زۆر ڕووەوە، لەڕووی شکڵ و شێوە و ڕەنگ و زمان و قەبارە و ...، ئەم جیاوازیانە هەر تەنها لە بوارە ماددی و جەستەییەکەوە نییە، بەڵکو لە بیرکردنەوە و مەیل و حەز و ئارەزوو و تەبیعەت و سەلیقە و غەریزە و زیرەکی و ...، بەشێوەیەك بە ئەستەم دوو مرۆڤی وەك یەکت دەست دەکەوێت، هەموو ئەمانەش بەڵگەی ڕوون و بەهێز و گەورەن لەسەر بوونی خودا و دەستەڵاتە بێسنوورەکەی، هەموو ئەمانە زەمینە خۆشکەرن بۆ ڕاجیایی و جیاوازی لە بیرکردنەوە و ئیعتیقاد و تەسەورات و دین بینی و دونیابینی، ئەم ڕاجیایی و جیاوازییە فیتری و زگماکیانەش دەکرێ ببنە هۆی خۆش بەختی مرۆڤەکان، دەشکرێ ببنە هۆی بەدبەختی و ناڕەحەتی دونیا و قیامەت و بە هەلاکچوونیان، کەواتە وەك هەموو شتەکانی دیکە دوو سەرەیە، دەکرێ بە چاك ئاڕاستە و تەوزیف بکرێت، دەشکرێ بە پێچەوانەوە بێت، کەواتە ئەوە ڕوونە کە جیاوازی و ڕاجیایی مرۆڤەکان شتێکی فیتری و زگماکییە و نیشانەی دەستەڵاتی خودایە و دەیتوانی هەمووان وەك یەك دروست بکات، بەڵام بە حیکمەت و قودرەتی خۆی وای

نەکردووە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ) هود ١١٨. واتە: خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و کۆمەڵ، (بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لەنێوانی یەکتردا لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا.



## مێژووی ڕاجیایی



**١.** دەگەڕێتەوە بۆ خودی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) چونکە ئەو خۆی ڕێیداوە و بواری بۆ هێشتۆتەوە و لەسەردەمی ئەویشدا لەسەر چەند پرس ڕاجیایی هەبووە بە وجودی ئەو.

**٢.** هاوەڵان و سەلەف لە تەفسیری قورئان ڕاجیایی زۆریان هەبووە.

**٣.** هاوەڵان لە شێوازی خوێندنەوەی قورئان ڕاجیاییان هەبووە.

**٤.** هاوەڵان و سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لە بەشێك لە بابەتە عەقیدەییەکان.

**٥.** هاوەڵان و سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لە بابەتە فیقهییەکان.

**٦.** هاوەڵان و سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لە هۆکاری دابەزینی سورەت و ئایەتەکان.

**٧.** هاوەڵان و سەلەف ڕاجیاییان هەبووە لە ئیجتیهاد و ئاڕاستەکانی، هەبووە زۆر پابەندی دەق بووە و زاهیری بووە، هەبووە زۆر مەقاسیدی بووە.

**٨.** دواتر لە سەردەمی تابیعین و تابیعی تابیعین و ... ڕاجیاییەکان زۆرتر و زیاتر بوون.

**٩.** دواتر مەزهەبە فیقهی و کەلامی و ئیعتیقادی و فیکریی و فەلسەفییەکان سەریانهەڵدا، دەیان ڕێباز و ڕەوت و مەزهەبی فیقهی و ئیعتیقادی دروستبوون، بۆنموونە لە فیقهدا: (حەنەفی، مالیکی، شافیعی، حەنبەلی، زاهیری، ...) لە ئیعتیقاددات: (خەواریج، شیعە، مورجیئە، جەبرییە، قەدەرییە، موعتەزیلە، کولابییە، ئەشعەری، ماتوریدی، سەلەفی، ....).

هەروەها پەیدابوونی یارانی فەرموودە (أهل الحدیث) و یارانی ڕەئی (أهل الرأی) و زاهیرییەکان (الظاهریة).

لێرەدا تەنها یەك نموونە دەهێنمەوە لەسەر ڕاجیایی کە لە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) و لە ناو هاوەڵاندا ڕوویداوە:

دوای جەنگی ئەحزاب پێغەمبەر (ﷺ) ویستی تیرەی بەنی قورەیزە تەمبێ بکات، لەسەر ئەو ناپاکییەی کردیان، بۆیە بۆ هاندانی هاوەڵان تا گورج بڕۆن پێی فەرموون: ((لا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ مِّنْكُمُ العَصْرَ إِلا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ)). البخاری ٩٤٦. واتە: ((هیچ یەکێك لە ئێوە نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قورەیزە نەبێت.))

هاوەڵان دەرچوون، لە ڕێگەدا بوون کە کاتی نوێژی عەسر هات، کۆمەڵێکیان وتیان: نوێژ ناکەین مەگەر لە بەنی قورەیزە نەبێت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) پێمانی فەرموو، کۆمەڵێکی تریشیان وتیان مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نەبوو کە لە بەنی قورەیزە نەبێت نوێژ نەکەین بەڵکوو مەبەستی ئەوە بوو کە پەلە بکەین، بۆیە

ئەمان لەڕێگەدا نوێژەکەیان کرد، کاتێکیش گەیشتنەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) سەرکۆنەی هیچکام لەم دوو دەستەیەی نەکرد، لەبەرئەوەی ئەوانەی نوێژەکەیان کردبوو کاریان بە فەرمانە خواییەکەی پێشوو کردووە {إِنَّ الصَّلاةَ كانَت عَلَى الْمُؤمِنينَ كِتابًا مَوقوتًا}، [النساء: ١٠٣] .

کە نوێژکردن لەکاتی خۆیدا دەبێت، ئەوانەش کە دوایان خستبوو کاریان بە ڕواڵەتی فەرمانەکەی دواتر کردووە کە نوێژ نەکەن مەگەر لە بەنی قورەیزە.

کەواتە بە وجودی پێغەمبەر (ﷺ) و لە ناو هاوەڵاندا ئەم ڕاجیاییانە و دەیانی دیکە ڕوویانداوە، ئەگەر بەوردی سەیری بکەی دوو ئاڕاستە و مەنهەجی جیاواز دەبینی لەم ڕووداوەدا، ئاڕاستە و مەنهەجی مەقاسیدی، ئاڕاستە و مەنهەجی زاهیری و ڕووکەشی.

هەبۆیە زانایان فەرموویانە: (رُخَصُ ابن عَبَّاس) ڕووخسەت و ئاسانکارییەکانی ئیبن عەبباس، (شَدَائِدُ ابنِ عُمَر) توندگیرییەکانی ئیبن عومەر (شَوَاذّ ابنِ مَسْعُود) شاز و ڕیزپەڕەکانی ئیبن مەسعود. واتە ئیبن عەبباس ئاسانکاری زۆر بووە و لە فەتوادا و ئاسانکار بووە و ڕووخسەتی زۆر بووە، ئیبن عومەریش لە فەتوادا توندگیر بووە کەمتر ئاسانکاری و ڕوخسەتی وەرگرتووە، ئیبن مەسعودیش شتی شاز و ڕیزپەڕ و نامۆی زۆر بووە لە فەتوا و بۆچووندا.

ئەگەر بڕوانینە دوای سەردەمی سەحابە و هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، هەموو ئەم مەنهەج و میتۆدانە دەبینی، زاهیری و مەقاسید، ئەهلی ڕەیی و ئەهلی حەدیس، توندگیر و ئاسانگیر و .... کەواتە ڕاجیایی و ئیختیلاف شتێکی فیتری و عەقڵی و نەقڵی و مێژووییە و ناکرێ و نابێ نکوولّی لێ بکرێت و هەوڵی لەناوبردن و لەباربردنی بدرێت، هەربۆیە مێژووش نەزۆکی هەموو ئەو هەوڵانەی سەلماندووە کە هەوڵی دژایەتی و نەهێشتنی ئیختیلاف و ڕاجیاییانداوە.



## سوودەکانی ڕاجیایی



**١.** هێشتنەوەی ئایین بە زیندویی و گونجاوی بۆ هەموو سەردەم و شوێن و کات و باردۆخەکان.

**٢.** ڕەحمەتە، چونکە مرۆڤەکان جۆراوجۆرن، بارودۆخ و شوێن و کات و سەردەمەکانیش ئەو جۆراوجۆری و جیاوازییە دەخوازێت لە هەموو شتەکاندا.

**٣.** فراوانکردن و جوانکردن و دەوڵەمەندکردنی ئایین و شەریعەت.

**٤.** فراوابوونی ئاسۆی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان و کردنەوەی عەقڵیان.

**٥.** دەستەبەرکردنی چارەسەری هەمەجۆر بۆ هەموو کێشە و ئاریشە و پێشهاتەکان.

**٦.** هاندان بۆ یەکتر قبووڵ کردن لە بابەتەکانی تریشدا، چونکە کە لە بابەتە ئایینییەکاندا یەکترمان قبوڵ کرد بەدڵنیاییەوە بۆ هەموو بابەت و کایەکانی تری ژیان ڕادێین.



## هۆکارەکانی ڕاجیایی



**١.** قورئان: خودی قورئان خۆی هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، چونکە هەم قیرائەتەکان هەم تێگەیشتن لە ئایەتەکان هەم خودی زمانی عەرەبی کە پێی دابەزیوە هەم مەنهەجی هەڵێنجانی ئەحکام و تێگەیشتنەکان لە ئایەتەکان هۆکارێکن بۆ ڕاجیایی.

**٢.** فەرموودە: سووننە هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، هەم لە ڕووی جێگیربوونییەوە، هەمیش لە ڕووی مانا و ڕاڤەکانی، هەمیش لە ڕووی گەیشتن بە زانایان و نەگەیشتن پێیان، هەمیش لە ڕووی کارکردن بە هەندێك فەرموودە لەلای هەندێك زانا و کارپێنەکردنی لەلای هەندێکی تریان، هەمیش لەڕووی مەرجەکانی وەرگرتن و کارپێکردنی لەلای زانایان و مەزاهیبەکان.

**٣.** سەرچاوەکانی شەریعەت و فیقهـ، (إجماع، قیاس، عرف، استحسان، ...)، چونکە بەڵگەکانی ئەحکام قورئان و سووننەی لێ دەرچێت زانایان قسەی جیاوازیان هەیە لە وەرگرتن و کار پێکردن و تێگەیشتن لێیان.

**٤.** زمان: چونکە وشە و دەستەواژەکان مانای جیاواز جیاوازیان هەیە کە لە کۆتاییدا سەردەکێشێت بۆ ڕاجیایی.

**٥.** شوێن و بارودۆخ و ژینگە و کات و سەردەم.

٦. بەرژەوەندی هەندێك كەس و زانا و تێكەڵكردنی هەندێ بابەت بە سیاسەت و دەستەڵات.

٧. جیاوازی عەقڵ و بیر و فیكرەكان.

٨. ڕاجیایی لە مەنهەجی هەڵێنجانی حوكم لە بەڵگە و جیاوازی لە مەنهەج و میتۆدی بیركردنەوە و هەڵێنجانی حوكم، چونكە قوتابخانەی جیاجیامان هەیە، بۆنموونە: مەهەجی نەقڵی و دەقگەرایی، مەنهەجی عەقڵی و عەقڵگەرایی، مەنهەجی مەقاسیدی و مەبەستگەرایی.

٩. ڕاجیایی لە پێناسە و تێگەیشتن لە ڕێگاكانی هەڵێنجانی حوكم (طرق استنباط الاحكام) بۆ نموونە: (مطلق، مقيد، عام، خاص، محكم، متاشبه، مجاز، حقيقة، كناية، مشترك، أمر، نهى، ناسخ، منسوخ، تعارض، ترجيح، مقاصد الشريعة و ...)، هەموو ئەمانە ڕاجیاییان تێدایە و ڕاجیاییشیان لێ دەكەوێتەوە.

تێبینی/ لە كۆتاییدا كتێبەدا بە درێژی باسی هۆكاری ڕاجیایی زانایان و فوقەهاء دەكەین.



## ڕاجیایی و ڕێ جیایی



ڕاجیایی و ئیختیلاف تا ئەو شوێنە ڕەحمەتە کە نەگات بە ڕێ جیایی و تەفرەقە و پەرتەوازەیی و دوژمنایەتی و دژایەتی، هەر کاتێك وای لێهات دەبێتە زەحمەت و نیقمەت و ناڕەحەتی، بۆیە بۆ ئەوەی لە ناو زانایانی موعتەبەردا هەبووە بریتیبووە لە ڕاجیایی نەك ڕێ جیایی، سەیری سێ ئیمامی گەورە و سەرمەزهەبی وەك (مالیك و شافیعی و ئەحمەد) بکە، ئیمامی شافیعی قوتابی ئیمامی مالیك بووە و ئیمامی ئەحمەدیش قوتابی ئیمامی شافیعی بووە _ ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _ لەگەڵ ئەو هەمووە ڕاجیاییە لە تێگەیشتن و مەنهەج و ... بەڵام ئەوپەڕی ئەدەب و ئەخلاقیان بەرامبەر یەکتری هەبووە، ئینجا بڕۆ زانایانی تر ....، بەڵێ ڕاستە قسەی ڕەق و هەڵوێستی نەخوازراویش هەبووە، چونکە زانایان و شوێنکەوتوانیشیان وەك هەر مرۆڤێکی دیکەی ئاسایی تووشی هەڵە بوونە، بەڵام ئەوە شتێکی شاز و کەم بووە و قیاسی لەسەر ناکرێت، لەوە زیاتر چی ئەو سەر مەزهەب و زانا گەورانەی وەك ئیمامی شافیعی و ئەحمەد لە ناوچەی ئەوی تریاندا چوونە سەر بۆچوونی یەکتر و نەیانهێشتووە شیرازەی کۆمەڵایەتی تێکبچێت و دووبەرەکی و دوژمنایەتی دروست ببێت.

## بنەماکانی تێگەیشتن لە مەزهەبی فیقهی

**١.** مەزاهیبی فیقهی ڕەحمەتن نەوەك زەحمەت.

**٢.** مەزاهیبی فیقهی لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت و بەڵگەکانی دیکەی فیقە دامەزراون، وەك (قیاس، ئیجماع، مەصڵەحەت، عورف، ....).

**٣.** مەزاهیبی فیقهی لە بنەڕەتدا بۆ نەهێشتنی تەفرەقە و خۆخۆییە، وە هەروەها کۆکردنەوەی ئەهلی عیلم لەسەر چەند ڕێڕەو و ڕێگەیەك بۆ ئەوەی گەڕەلاوژێ و فەوزای فیقهی دروست نەبێت.

**٤.** مەزاهیبی فیقهی زۆر گرنگە بۆ تەبایی کۆمەڵایەتی و فیکری.

**٥.** سەرمەزهەبەکان و زاناکانیان ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستییان بۆ یەکتری هەبووە، ئەگەر هەندێ شتی نەخوازراویش هەبووبێت ئەوە شتێکی ڕیزپەڕ و شاز بووە و حاڵەت بووە نەك دیاردە.

**٦.** مەزهەبە فیقهیەکان گەورەترین خزمەتیان بە قورئان و سوننە و ئیسلام و موسڵمانان کردووە.

**٧.** مەزهەبە فیقهییەکان گەورەترین خزمەت دەکەن بۆ وەڵامی پرسیارەکان و چارەسەری کێشەکان.

**٨.** لامەزهەبی لە خودی خۆیدا واتە مەزهەبی بوون، چونکە لامەزهەبیش لەکۆتاییدا دەبێت بە مەزهەب، بەڵام ئەو کات خراپتر دەبێت، چونکە بە ئەندازەی موجتەهید و زاناکان مەزهەب پەیدا

دەبن، ئینجا دەبێ ئەوەش بوترێت کە ئەم مەزاهیبانە هەموویان میتۆد و مەنهەجێکی عیلمییان هەیە و شتەکانیان هەڕەمەکی نیە.

## چۆن مامەڵە لەگەڵ مەزهەبە فیقهیەکاندا بکەین؟

**١.** مەزهەب تێگەیشتن و فیقهە بۆ دین نەك خودی دین، شتە نەگۆڕەکان بەپێی مەزهەبەکان ناگۆڕێن و هەموویان کۆك و هاوڕان لەسەری، بۆنموونە واجبوونی نوێژ و سوجدە و ڕوکوع، واجبوونی زەکات و حەج و ڕۆژوو، حەرامبوونی زینا و دزی و کوشتنی بە ناحەق و ...، بەڵام ئیجتیهادە تاکەکەسییەکان و ئەوانەی بە پێی شوێن و کات و سەردەم و ژینگە دەگۆڕێن ئەوانە یەکسان نیین بە خودی دین، بەڵێ لە دیندا جێیان دەبێتەوە، بەڵام دین لەواندا کورتهەڵنەهاتووە و ناکرێ خەڵکی لەسەر گومڕا و تەبدیع و تەفسیق بکرێت. مەزهەبەکان لە دیندا جێیان دەبێتەوە و خزمەتکار و ڕاڤەکاری دینن، بەڵام دین لە یەك تاکە مەزهەبدا جێی نابێتەوە، چونکە دین لە مەزهەب گەورەترە و ...

**٢.** ئەسڵ وایە هەر شوێنێك شوێنکەوتەی مەزهەبێك بوو ئەم تەبابییە تێك نەدرێت، بەڵام ئەوەشمان بیرنەچێت پابەندکردن بە مەرهەبەوە بە شەخس و زانا و ڕەوت و حیزب ناکرێ، بەڵکو دەبێ دەستەڵات و دەوڵەت ئیلزام و پێویستی بکات و بیکات بە یاسا، وەك چۆن لە دەوڵەتی عوسمانیدا فیقهی حەنەفی کرا بە یاسا و قانون کە لە کتێبی (مجلة الأحكام العدلية) دا خۆی دەبینێتەوە، کەواتە

بەبێ پاڵپشتێکی یاسایی و دەوڵەتی ئیلزامکردنەکە زۆر قورسە و جێبەجێ ناکرێ، مەگەر لەسەر ئاستی هەندێ ڕەوت و کەسی دیاریکراو.

**٣.** دەرچوون لە مەزهەب بەهیچ جۆرێك یەکسان نیە بە دەرچوون لە دین، ئەوەتا زاناکانی ناو مەزهەبەکان لە چەندین بابەتدا لە مەزهەبی خۆیان دەرچوونە، یان تەرجیحی بۆچوونێکیان داوە کە موخالیفی بۆچوونی سەرمەزهەبەکەی خۆیان بووە.

**٤.** زۆر ئاساییە بۆ هەندێ بابەتی سەردەمی کە پێشووتر نەبووە، یان بەم شێوەیە نەبووە، یان ڕووی ڕاستەقینەی دەرنەکەوتووە، یان بە هەڵە ڕاڤەکراوە و بەهەڵەش حوکمی لەسەر دراوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی نوێ بکرێ، بەتایبەت لە بابەتی مامەڵەکان و موعامەلات و بابەتە پزیشکیەکان و بابەتە فیکری و حوکمڕانی و سیاسییەکان.

**٥.** دەرگای ئیجتیهاد داناخرێت، بەتایبەت بۆ ئەو بابەتانەی باسمانکردن.

**٦.** تەعەسسوب و دەمارگیری مەزهەبی خودی دین و مەزهەبیش ناشیرین دەکات و زیانی پێ دەگەیەنێت.

**٧.** تەوفیق کردن لە نێوان زانایانی کۆن و تازە و بۆچوونە کۆن و تازەکاندا.

٨. بە ڕەحمەت زانینی ئیختیلافی فیقهی.

٩. بەخێر و بەڕاست زانینی هەموو مەزهەبەکان، واتە پێت وانەبێت بەس یەك دانەیان ڕاست و ڕەحمەتە و ئەوانی دیکە زەحمەت و نیقمەت.

١٠. ڕێزگرتن لە زانایان و بۆچوونەکانیان.

١١. دانانی ئەگەر (احتمال)ی ڕاستبوونی بەرامبەر.

١٢. ئینکاری نەکردن لەبابەتی ڕاجیایی لەسەر.

١٣. بڕوابوون بە پاداشت وەرگرتنی هەموو موجتەهیدانی خاوەن ئیجتیهاد مادام ئەهلی ئیجتیهاد بن با هەڵەشیان کردبێت و نەیان پێکابێت.

١٤. ئینکاری و نکووڵی نەکردن لە بابەتی ڕاجیایی لەسەر.

١٥. دوورکەوتنەوە لـــە گومـــانبردنی خـــراپ و بەکارهـــێنانی دەستەواژەی نادروست بەرامبەر یەکتری.

١٦. لەکاتی ڕەخنەگرتن ڕەچاوی بنەماکانی ڕەخنە بکرێت و لە چوارچێوەی ئەخلاق و ئیمان دەرنەچێت.

١٧. باسکردنی جوانیەکانی بەرامبەر و ڕاڤەکردنی بۆچوونەکانیان بە جوانترین شێوە.

١٨. عوزر هێنانەوە بۆ زانایان و هەڵە و نەپێکانەکانیان.

**١٩.** بە بەڵگە و دەلیل و مەقاسیدی شەریعە ئیختیلافەکان بپێورێن.

## جیاوازی مەزهەب و دین

**١.** مەزهەب (ئیجتیهادی زانایان) ئینسانییە لە ژێر ڕۆشنایی دەقدا، دیـــن ئیلاهـــیـە.

**٢.** مەزهەب جۆراوجۆرە و چەندایەتی تێدایە، دین تاکە.

**٣.** مەزهەب ڕاست و هەڵە هەڵدەگرێت، دین بێ هەڵەیە.

**٤.** مەزهەب بەپێی شوین و کات و سەردەم و بارودۆخ دەگۆڕێت، دین نەگۆڕە.

**٥.** هەرکەسێ دەرچێت لە مەزهەب و باوەڕی پێی نەبێت پێی کافر و بێباوەڕ نابێت، دین هەر کەسێك لێی دەرچێت و باوەڕی پێی نەبێت پێی کافر دەبێت.

**٦.** مەزهەب کاریگەرە بە کات و شوێن و کەس و بارودۆخ و ژینگە، دین بێ کاریگەرە بە مانە.

**٧.** مەزهەب ئیلزامی نییە، دین ئیلزامییە.

**٨.** مەزهەب سنووردار نییە، دین سنووری هەیە.

**٩.** خاوەنی مەزهەب زانایانی خودی مەزهەبەکەن، خاوەنی دین خوا و پێغەمبەرن.

**١٠.** مەزهەب و خاوەنەکانی مەعسوم نیین، دین مەعسومە.

**١١.** مەزهەب نوێگەری تێدا دەکرێت، دین نوێگەری تێیدا ناکرێت. مەزهەب بەشێوەیەکی گشتی دەستکاری و تەعدیلی هەیە، دین قابیلیەتی ئەوەی نییە.

**١٢.** لە مەزهەبێکدا ناتوانی هەموو مەزهەبەکان کۆبکەیەوە، بەڵام لە دیندا دەتوانی هەموان کۆبکەیەوە، واتە دین بە تەنها لە هیچیاندا کورتهەڵنایەت و جێی نابێتەوە لە یەك دانەیان بەتەنها، بەڵام هەموویان لە دیندا جێیان دەبێتەوە، چونکە دین گەورەترە لە هەموو مەزهەبەکان.

**١٣.** مەزهەب تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بۆ دین، دین پەیامی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی.



## ڕاجیایی عەقیدەیی



وەك بابەتە فیقهییەکان بابەتە ئیعتیقادییەکانیش بە هەمان شێوە ئیختیلاف و ڕاجیایی زۆریان تێدایە، بەڵام ئەم ڕاجیاییانە لە جوزئیاتدان نەوەك لە کولیاتدا، هەربۆیە هە لەسەردەمی هاوەڵان و سەلەفەوە تاوەکو ئێستا ئەم ڕاجیاییانە بەردەوامییان هەیە، ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی دەیان گروپ و ڕێباز و قوتابخانەی ئیعتیقادی وەك: (خەواریج و شیعە و جەبرییە و مورجیئە و قەدەرییە و کولابییە و موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدی و سەلەفی و ...).

### باروردۆخی عەقیدە لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ)

لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) دا، باروردۆخی عەقیدە زۆر جیاواز بوو، چونکە ئەم هۆکارانە بوونیان نەبوو کە بوونە هۆی پەیدابوونی ئەم ڕاجیاییانە، وە خودی پێغەمبەر (د.خ) لەناویاندا بوو و هەر شتێ هەبا بە زووترین کات وەڵامی دەدانەوە و هەمووانیش پێی ڕازی دەبوون و دڵ و عەقڵیان لەسەری گرێ دەدا! هەر بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) دا، جیاوازی و ڕاجیایی زۆر کەمبوو، وە ئەوەندەی سەرقاڵ بوون بە عەمەل و کار و کردەوە و دەعوە و بانگەواز ئەوەندە نەدەپرژانە سەر گفتوگۆی بێ بەرهەم و نەزۆك، ئەوان کۆمەڵگەیەکی دامەزراو و عەمەلی بوون، وە کاریگەر بوون بە وەحی و پێغەمبەر (د.خ) بوو، نەك بە فیکرە بیانی و

دەرەکییەکان، هەر بۆیە بارودۆخی عەقیدە لەم کاتەدا باردۆخێکی ئارام و بێ گرێ و گۆڵ بوو، بارودۆخێکی فکری عەمەلی قورئانی پێغەمبەرانە بوو.

## هۆکارەکانی پەیدابوونی ڕاجیایی و جیاوازی عەقیدەیی و کەلامی

هەبوونی ڕاجـــیایی هــزری و عـــقیدەیی بۆ چـەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە:

**١.** قورئان، خودی قورئان خۆی هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، چونکە هەم قیرائەتەکان هەم تێگەیشتن لە ئایەتەکان هەم خودی زمانی عەرەبی کە پێی دابەزیوە هەم مەنهەجی هەڵێنجانی ئەحکام و تێگەیشتنەکان لە ئایەتەکان هۆکارێکن بۆ ڕاجیایی.

**٢.** سوننە، حەدیس، فەرموودە، سوونتە هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، هەم لە ڕووی جێگیربوونیەوە، هەمیش لەڕووی مانا و ڕاڤەکانی، هەمیش لەڕووی گەیشتن بە زانایان و نەگەیشتن پێیان، هەمیش لە ڕووی کارکردن بە هەندێ حەدیس لەلای هەندێ کەس و کارپێنەکردنی لەلای هەندێکی تریان.

**٣.** هۆکاری سیاسی، بۆنموونە کێشەی ئیمامەت و سەرۆك و کێشەی خەواریج و ئیمامی عەلی و موعاویە، یان سەرەتای سەرهەڵدانی شیعە، کە پێیان وابوو ئیمامی علی لە هەموو کەس شایەنترە بۆ خەلیفایەتی، یان گروپەکانی تر کە زۆربەیان دوورنەبوون لەو هۆکارە، هەربۆیە دواتر دەوڵەتیان هەبووە، وەك موعتەزیلەکان.

**٤.** زمان، چونکە وشە و دەستەواژەکان مانای جیاواز جیاوازیان هەیە کە لە کۆتاییدا سەردەکێشت بۆ ڕاجیایی. بۆنموونە ڕێبازی تەشبیە و تەنزیە (وێچوێنەرەکانی خودا بە دروستکراوەکانی) (پاك ڕاگرەکان) بەهۆی جیاوازی لە دەستەواژەی ئایەتەکانی ناو و سیفەتەکانی خودا پەیدا بووە، یان ڕێبازی قەدەرییەکان و جەبرییەکان بەهۆی جیاوازییان لە دەقەکانی قەدەر و قەزا پەیدابووە، یان جیاوازی گروپە کەلامییەکان و تێڕوانینیان بۆ ئیمان بەهۆی جیاوازییان بووە لە تێڕوانینی زمانەوانی بۆ ئیمان.

**٥.** شوێن و باردۆخ و ژینگە و کات و سەردەم.

**٦.** بەرژەوەندی هەندێ کەس و زانا.

**٧.** وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفیەکان. کە کتێبە فەلسەفیەکان وەرگێڕدران لەلایەن خودی موسڵمانانەوە، هەبوو پێی کاریگەر بوو، هەبوو دژی بوو و ڕەدی دەدایەوە، هەشبوو ڕاڤە و شەرحی دەکرد، هەشبوو دەیویست هەماهەنگی دروست بکات لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا

**٨.** هاتنە ناوەوەی غەیرە موسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان. کە ئەم جۆرانە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە پاشخانێکی تری فکرییان هەبوو، ئیدی بەم هۆیەوە زانستی کەلامیش هاتە مەیدان بۆ وەڵامدەنەوەیان.

**٩.** خودی عەقڵ خۆی، چونکە عەقڵیش لە خودی خویدا هۆکارێکە چونکە عەقڵەکانیش جیاوازن.

دەربارەی پاڵنەرەکان توێژەرانی زانستی کەلام بوونە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی نییە، ئەوەی هەیە ناوخۆییە.

**دووەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی هەیە، وەك نەسرانیەت و یەهودیەت و غەنوسیەت و فەلسەفەی یۆنانی.

د. عەلی سامی نەششار زانای کەلام و توێژەر لەم بابەتەدا پێی وایە بەهیچ جۆرێك پاڵنەری دەرەکی بوونی نییە و ئەوەی هەیە بریتییە لە پاڵنەری ناوخۆیی، ئەویش دوو شتە: سیاسی و زمان، واتە زمانی دەق، چونکە کە ڕاجیایی لە زمانی دەقدا دروستبوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر تێڕوانینیەکاندا، لەگەڵ سیاسەت.

بۆ کاریگەری فەلسەفەی یۆنانیش پێی وا نییە زانستی کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بن، یازدە قوتابخانە ئەسڵییەکەی فەلسەفەی یۆنانی باس دەکات، پاشان ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بووبن، بەڵکو وەڵامیان داونەوە، بۆیە ئەو زانستی کەلام بە فەلسەفەی ئیسلامی ناوزەند دەکات، زاناکانیشی بە (فەیلەسوفە موسڵمانەکان)، فەیلەسوفانی تری وەك ئیبن سینا و فارابی و... بە (فەیلەسوفە ئیسلامییەکان) ناوزەند دەکات، چونکە پێی وایە ئەوانە فەلسەفەی یۆنانییان هێناوە و پاشان بەرگێکی ئیسلامییان کردۆتەبەر و ویستوویانە تەوفیق بکەن لەنێوانیاندا و ئیسلام لەگەڵ فەلسەفەی یۆنانیدا بگونجێنن، ئەمە

ڕای د. عەلی سامی نەششارە، پەرتووکە بەناوبانگەکەشی ناوناوە (گەشەکردنی هزری فەلسەفی لە ئیسلامدا) (نشأة الفكر الفلسفي في الإسلام).

### ئەو بابەتانەی ڕاجیاییان تێکەوت

**١.** قەدەر، لە کۆتاییەکانی سەردەمی هاوەڵاندا مەعبەدی جوهەینی و غەیلانی دیمەشقی و یونسی ئەسواری نوکوڵی ئەوەیان کرد خێر و شەڕ پاڵ بدرێ بۆلای خوای گەورە و نوکوڵی قەدەریان کرد.

**٢.** پاشان بابەتی ئافراندن و خەلق و مەخلوقیەتی قورئان.

**٣.** پاشان نەفی کردنی سیفاتی خوای گەورە.

**٤.** پاشان ئیرجاء، واتە تاخیر کردن، واتە جیاکردنەوەی کار و کردەوە لە ئیمان و باوەڕ.

**٥.** پاشان نەفی کردنی قەدەر و زانستی خوای گەورە بە شتەکان پێش ڕوودانیان، واتە خوای گەورە زانستی بەهیچ شتێك نیە مەگەر دوای ڕوودانی ڕووداوەکان نەبێت.

**٦.** پاشان جەبر، واتە مرۆڤ موجبەرە و هەموو شتێکی بەسەردا سەپێنراوە و هیچ شتێکی هی خۆی نیە و هەموو شتێکی بۆ بڕیاردراوە.

**٧.** پاشان پلەیەك لەنێوان دوو پلەدا (المنزلة بين المنزلتين) کە موعتەزیلەکان دایانهێنا.

## قۆناغەکانی زانستی کەلام و عەقیدە

زانستی کەلام و بابەتە کەلامیەکان بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕین:

**قۆناغی یەکەم:** قۆناغی موتەکەلیمە سەرەتاکان، وەك واسیلی کوڕی عەتا و عەمری کوڕی عوبەید و ئەبو هوزەیلی عەللاف و ئیبراهیمی نەززام و ... .

ئەم قۆناغە بەوە جیادەکرێتەوە کە کاریگەر بووە بە دەستەواژە یۆنانیە فەلسەفییەکان، بەتایبەت لەلای موتەکەلیمە کۆتاکانی وەك عەللاف، چونکە لەم سەردەمەدا کتێبە فەلسەفییە یۆنانیەکان وەرگێڕدران بۆ سەر زمانی عەرەبی، بەڵام زانستی کەلام لەم قۆناغەدا بەشێوەیەکی ڕێکخراو و وەك زانستێکی سەربەخۆ نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی پەرشوبڵاو بوو، وە هەروەها تێکەڵ نەبوو بوو بە لۆژیکی ئەرستۆیی.

**قۆناغی دووەم:** لەم قۆناغەدا ئەشعەرییەکان هاتنە مەیدان و زانستی کەلام سەربەخۆیی وەرگرتوو بوو بە زانستکی سەربەخۆی خاوەن یاسا و بنەما، هەر لەم قۆناغەدا بوو زانستی کەلام گەشەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی و وەڵامی زۆرێك لە بابەتە فەلسەفە کەلامییەکان درایەوە و بەرهەڵستی فەلسەفەی یۆنانی کرا، بۆنموونە داهێنانی بیرۆکەی جەوهەری فەرد و بەکارهێنانی دژی تەوژمی فەلسەفەی یۆنانی و ئەوانەی پێی کاریگەربوون.

هەر لە کۆتاییەکانی ئەم قۆناغەدا بوو لۆژیکی ئەرستۆیی بەکارهێنرا لە پرس و کتێبە کەلامیەکاندا.

**قۆناغی سێیەم:** تێکەڵکردنی فەلسەفە و کەلام بەیەکتری، بەشێوەیەك لێك جوداکردنەوەی زۆر زەحمەت بوو، لە کۆتاییشدا بەشێکیان پێی سەرسامبوون و تەقلیدیان کرد.

# مەنهەج و میتۆدە سەرەکیەکانی زانستی کەلام

زانستی کەلام چەندان گروپ و تەوژم و قوتابخانەی تێدایە، لەژێر ڕۆشنایی ئەمەدا دەتوانین چەندا مەنهەج و میتۆدێك هەڵبێنجین:

١. مەنهەج و میتۆدی نەقڵی.
٢. مەنهەج و میتۆدی عەقڵی.
٣. مەنهەج و میتۆدی تەکاملی.
٤. مەنهەج و میتۆدی ویژدانی و عیرفانی و تەسەوفی.

## یەکەم: مەنهەج و میتۆدی نەقڵی

بنەماکانی ئەم مەنهەجە ئەمانەی خوارەوەن:

١. ئیجماع و کۆدەنگی هاوەڵان و سەردەمی یەکەمی هیجری.
٢. خەبەر و فەرموودەی موتەواتیر.
٣. خەبەر و فەرموودەی ئاحادی وەرگیراو و مەقبول.
٤. وەرگرتنی قورئان و سوننە بەبێ تەئویل.
٥. نەگرتنەبەری ڕێگەی مەجاز.

**٦.** دەرنەبڕینی بۆچوون :

**أ.** لە کاتی نەبوونی دەق لە بابەتەکەدا.

**ب.** لە کاتی دژیەك وەستان و تەعاروزی دوو دەقدا و نەبوونی هیچ یەکلاکەرەوەیەك.

**ج.** لە کاتی موجمەل بوونی دەق و موتەشابیە بوونی، یان ناڕوونی واتا و ماناکەی.

ئەوە مەنهەجی ئەهلی حەدیس و سەلەفیەتە.

## دووەم: مەنهەج و میتۆدی عەقڵی

ئەم مەنهەجەش بەم تایبەتمەندیانە جیادەکرێتەوە:

**١.** زەرورە عەقڵی و فیترییەکانی (الضرورة العقلية والبدهيات العقلية المنطقية) بۆنموونە مەحاڵ بوون و ئەستەمبوونی دەور و تەسەلسول و کۆبوونەوەی دوو دژ بەیەك لە یەك کات و شوێندا.

**٢.** بنەما فەلسەفیە سەلمێنراوەکانی وەك: بنەمای هۆکار و ئەنجام (العلية) و دابەشبوونی بوون بۆ: بوون واجب و بوون مومکین و بوون مەحاڵ (واجب الوجود، مومكن الوجود، مستحيل الوجود).

**٣.** دانانی دەق بە پاڵپشت و پشیتوانی بنەما عەقڵیەکان.

**٤.** تەویلی هەر دەقێك کە - زاهیران یان لە ڕووکەشدا - دژ بە عەقڵ بێت.

**٥.** تەئویلی دەقە موتەشابیهەکان، بەشێوەیەك بێنەوە لەگەڵ عەقڵدا.

**سێیەم: مەنهەج و میتۆدی تەواوکاری (تەکامولی)**

ئەم مەنهەجەش تایبەتمەندی خۆی هەیە:

**١.** کۆکردنەوەی عەقڵ و نەقڵ بەیەکەوە، چونکە هیچ دژیەکیەك نیە لەنێوانیاندا، نە لە حەقیقەتدا نە لە واقیعدا.

**٢.** وەرگرتنی زاهیری دەق ئەگەر هاتوو هیچ نیشانە و قەرینە و بەڵگەیەکی دیکە نەبوو ئەم دەقە لە زاهیرەکەی لابدات، بەڵام بەمەرجێك دژیەك نەبێ لەگەڵ بنەما عەقڵیە نەگۆڕەکاندا.

**٣.** ئایەتەکانی قورئان هەندێکیان پاڵپشتی هەندێکیان دەکەن و یەکتر تەواو دەکەن.

**٤.** سوونەی سەحیح و قەتعی قورئان ڕاڤە دەکات و تەواوکاری قورئانە.

**٥.** تەئویل دروستە کاتێ دەق تەئویل دەخوازێت.

**٦.** مەجاز دروستە و هەیە.

**٧.** ڕاڤەی موتەشابیە بە موحکمە و تەئویل کردنی لەژێر بنەما عەقڵیەکاندا.

ئەم مەنهەجە مەنهەجی ئەشعەریەکان و ماتوریدیەکانە.

## چوارەم: مەنهەج و میتۆدی ویجدانی و عیرفانی

ئەم مەنهەجەش ڕێباز و تەوژمی جیاجیای تێدایە، هەیانە زۆر دورکەوتۆتەوە لە عەقڵ و نەقڵ، پشتی تەنها بە لایەنی ڕووحی و پاڵفتەی دەروون و ئیلهامات بەستووە، هەشیانە لەگەڵ ئەم لایەنەشدا بەڵام پشتئەستوورە بە قورئان و سونئەت.

کەواتە لە جوزئیاتی عەقیدەشدا ئیختیلاف هەیە، هەربۆیە ئەم هەموو ڕەوت و ڕێباز و مەزهەبە پەیدا بوون.

## بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی

ئایین شتێکە و مەزهەب شتێکی تر، ئایین خواییە و مەزهەب ڕا و تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بۆ ئایین.

**بنەمای ئایینی:** بریتین لەو بنەما و پرەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایینن و لادان لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار دەکرێت.

**بنەمای مەزهەبی:** بریتین لەو بنەما و پرەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایین نین، بەڵکو ئەسڵ و بنەمای مەزهبین، وە لادانیش لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار ناکرێت، بەڵکو بە لادان لە مەزهەب هەژمار دەکرێت.

کەواتە لادان لە بنەمای ئایین لادانە لە خودی ئایین و چونە دەرەوەیە لە بازنەکەی.

لادانیش لە بنەمای مەزهەبی لادانە لە مەزهەب و چونە دەرەوەیە لە بازنەی ئەم مەزهەبە.

بۆنموونە باوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی بنەمای ئایینین، ئەگەر کەسێك باوەڕی پێیان نەبێت لە بازنەی ئایین و ئیسلام دەچێتەوە دەرەوە و بە ئیماندار و موسڵمان هەژمار ناکرێت.

بەڵام باوەڕبوون بە پلەیەك لەنێوان دووپلەدا (المنزلة بين المنزلتين) ی موعتەزیلەكان و (ئیمامەت) ی شیعەكان، بنەمای مەزهەبین، واتە ئەگەر موعتەزیلییەك باوەڕی بە پلەیەك لەنێوان دووپلەدا (المنزلة بين المنزلتين) نەبێت لە بازنەی ئیعتیزال دەچێتەدەر و بە موعتەزیلە هەژمار ناكرێت لای موعتەزیلەكان، بەڵام ئەوەندە هەیە، كە بەس لە مەزهەب چۆتە دەر نەك لە ئایین، واتە لای ئەوان موعتەزیلە نییە، بەڵام ئیماندار و موسڵمانە و لە بازنەی ئیسلام و ئیمان نەچۆتەدەر، تەنها لە بازنەی ئیعتیزال چۆتە دەر.

وە بۆنموونە (ئیمامەت) لای هەندێ لە شیعەی دوازدە ئیمامی بنەمای مەزهەبییە ـ لای هەندێكی تریان بنەمای ئایینییە ـ، كەواتە بەم پێیە ئەگەر كەسێك باوەڕی بە ئیمامەت نەبێت ئەوە لە بازنەی شیعەی دوازدە ئیمامی چۆتەدەر و بە شیعە هەژمار ناكرێت، بەڵام بە موسڵمان و ئیماندار هەژمار دەكرێت چونكە لە بنەمای ئایینی دەرنەچووە. العقيدة الإسلامية ومذاهبها، د. عبد الرحمن قحطان الدوري.

### بنەمای لادانە عەقیدەیی و كەلامی و فكرییەكان

**١.** باوەڕنەبوونی درووست بەخودا و ماهیەت و حەقیقەتی.

**٢.** باوەڕنەبوونی تەواو بە وەحی و پەیامی خوایی.

**٣.** باوەڕنەبوونی تەواو بە كاملی و تەواوی شەریعەت و ئایین.

**٤.** باوەڕنەبوون بە كۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی.

**٥.** ڕاڤەی نادروست بۆ زیندوبونەوە و ڕووح.

٦. تەحریف و لادان لە مەبەستە سەرەكییەكانی ئایین.

٧. تەحریف و لادان لە ڕووحی قورئان.

٨. تەكفیر.

٩. خۆبینینەوە لە بازنەی حەق و خەڵك بینین لە بازنەی ناحەق.

١٠. تەقلید و چاولێكەری و تەمبەڵی مەعریفی و گەڕان بە دوای ڕاستی ڕێباز و قوتابخانەكان.

١١. لادانی ئەخلاقی و نەهێشتنی سنوری بەهاكان.

١٢. عەقڵگەرایی زێدەڕۆیانە.

١٣. بێ ویست كردن و بێ ئەرزش كردنی مرۆڤ.

١٤. بەخوا كردنی مرۆڤ.

١٥. دەقگەرایی و زاهیری بوون.

ئەوەی كە باسمان كردن پوختەی بنەماكانی لادانە كەلامی و عەقیدەیی و فكرییەكان بوون، كە تەوژم و ڕێبازە كەلامی و عەقیدەیی و فكری و فەلسەفییەكانی ناو مێژووی موسڵمانان تێی كەوتبوون، بەڵام بەڕێژەی جیاجیا، بەڵام بەشێوەیەكی گشتی ئەوەی پێی دەوترێ سوونی ڕەسەن (بە مانا فراوانەكەی، نەك بەمانا تەسك و تەنگەكە و كورتهەڵێنانی لە تەوژم و ڕێبازێكی دیاریكراو) لادانەكەیان لە بازنەی جوزئیاتدایە و نەپەڕیوەتەوە بۆ بازنەی كولیات و قەتعیات و بنەما نەگۆڕەكان.

## هەڵوێستی دروست بەرامبەر تەوژوم و قوتابخانە کەلامی و عەقیدەیی و فکرییەکان

سەرەتا دەبێ بیانکەینە دوو جۆر

**جۆری یەکەم:** مەبەست و نییەتیان پاکە و بەهەڵەداچوون.

**جۆری دووەم:** هەڵەن و خەڵکیش بەهەڵە دەبەن و مەبەستیشیان بەلاڕێدابردن و سەرلێشێواندنی خەڵکە.

جۆری دووەم نابێ بێنینە ناو مامەڵەی جۆری یەکەمەوە

**١.** هەمووان بە تێگەیشتن بە ڕاڤە و تەفسیر و هەوڵ و.... بۆ ئایین تێبگەین نەك وەك خودی ئایین.

**٢.** دەبێ بیروڕاکان لێك جیا بکەینەوە، بزانین ئەو ئیجتهادەی کە کردوویانە لە ئوسوڵدایە یان لە فروع، لە قەتعیاتدایە یان لە ظەنیات، ئەگەر لە ظەنیاتدا بوو ئەوە دەبێ بە سینگێکی فراوانەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، مەرج نییە هاوڕایان بین، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادەکەیان لە قەتعیاتدا بوو ئەوە دەبێ هەڵوێستە بکەین و نابێ تەسلیم بین، بۆ نموونە بڵێن خودا نەزانە، یان هەموو شتێ نازانێت، یان بڵێن مرۆڤ دەگاتە ئاستی خودا یان تێیدا دەتوێتەوە، یان قورئان دەستکاری کراوە، یان پێغەمبەرایەتی بەردەوامە، یان....، لەم جۆرانە نابێ سازش بکرێت و دەبێ ڕاست بکرێنەوە.

**٣.** هەتا بکرێ گومانی باشیان پێ ببەین.

**٤.** ڕا و بۆچون و بنەماکانیان وەك خۆی ڕاقە بکەین و لێیان تێبگەین و بەلاڕێیاندا نەبەین.

**٥.** بۆ ڕاوبۆچونەکانیان بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆیان.

**٦.** جیاوازی بکەین لە نێوانیاندا، چونکە هەر قوتابخانەیەك بەدەیان و جاری وا هەیە بە سەدان ئاڕاستەی تێدایە، کەواتە ناکرێ قسەیەك کە کراوە پاڵی بدەیە لای هەموویان.

**٧.** هۆکار و پاڵنەرەکانی پشت ڕاوبۆچونەکانیا بخوێنینەوە، چونکە هەموو شتێك پاڵنەر و هۆکاری خۆی هەیە.

**٨.** هەتا دڵنیا نەبین لەوەی کە ئەم شتەیان کردووە یان گوتووە نەیاندەینە پاڵ.

**٩.** وەك مرۆڤ سەریریان بکەین.

**١٠.** لەسەردەم و کات و شوێن و ژینگە و بارودۆخی خۆیاندا خوێندنەوەیان بۆ بکەین.

**١١.** هەوڵی لێك نزیك بوونەوەیان بدەین.

**١٢.** نەوروژاندنی خیلاف و جیاوازی نێوانیان لەناو خەڵکی سادە و غەیرە تایبەتمەند بەم بابەتانەوە.

**١٣.** بەدین نەکردنی بیروڕای قوتابخانەکان، چونکە لە کۆتاییدا هەمووی ڕاوبۆچونی مرۆڤە.

**١٤.** دروستکردنی گفتوگۆ و دیالۆگ لە نێوانیاندا.

**١٥.** مامەڵە نەکردنی بەرژەوەندی خوازانە لەگەڵیاندا.

**١٦.** نەبوونی دەمارگیری بۆ لایەك و قوتابخانەیەك.

## جیاکاری نێوان
## (مذهب، منهج، عقیدة)

(مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆد (عقیدة) بیروباوەڕ، لێك جیاوازن و یەك شت نیین، کە بەداخەوە زۆرجار تێکەڵ بەیەکتری دەکرێن و حوکم لەسەر ئەم تێکەڵییە بنیات دەنرێت!

قوتابخانە کەلامی و عەقیدەییەکان (مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆدیان لەیەك جیاوازە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی عەقیدەیان یەك شتە، چونکە عەقیدە تەنها بیروباوەڕە نەگۆڕە قەتعییەکان دەگرێتەوە، نەك گۆڕاو و جوزئییەکان، واتە ئەوانەی قبوڵی ئیجتیهاد و تێڕامان دەکەن ناکرێ کەسی لەسەر تەکفیر بکرێت و بە بنەما و ئەسڵی عەقیدە و دین دابنرێن و خەڵکیان لەسەر موحاسەبە بکرێت، کەواتە جەماوەری موسڵمانان لەسەر بنەما نەگۆڕە قەتعییەکانی وەك (بوونی خودا، زیندووبوونەوە، وەحی، پێغەمبەرایەتی،...) هاوڕان، ئەوەی تر دەبێتە مەزهەب و مەنهەج، مەنهەجی یەکێکیان عەقڵییە و هی یەکێکی دیکە نەقڵی و هی یەکێکی دیکە تێکەڵ لە نەقڵ و عەقڵ، هی یەکێکیان نزیکتر لە وەحی و هی یەکێکی تر دوورتر، هەروەك چۆن لە فیقهیشدا ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس هەیە، ئەم دوانەش مەنهەج و مەزهەبیان جیاوازە، نەوەك دینیان لەیەك جیاواز بێت. کەواتە ئەوەی گرینگە ئەوەیە ئێمە جیاکاری بکەین

لە نێوان (مذهب) ڕێباز و (منهج) میتۆد و (عقیدة) بیروباوەڕ و قەتعیات و ظەنیات و کولیات و جوزئیاتدا.



## فیقهی ئەولەویات



فیقهـــی ئەولەویات بابـەت و زاستێکی گرنگە بۆ دینبینی و دونیابینی و مامەڵەی دروست لەگەڵیاندا، وە هەروەها پاڵنەر و ئامـرازێکی گرنگیشە بۆ مـــامەڵەکردن لەگــەڵ پرســە دینی و دونیاییەکان و پێشخستنی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا، بۆیە لێرەدا زۆر بە کورتی باسیان لێوە دەکەین.

### فقـه الأولـويـات :

١. أولوية الكيف على الكم
٢. أولوية العلم على العمل
٣. أولوية الفهم على مجرد الحفظ
٤. أولوية المقاصد على الظواهر
٥. أولوية الاجتهاد على التقليد
٦. أولوية التخفيف والتيسير على التشديد والتعسير
٧. أولوية العمل الدائم على العمل المنقطع
٨. أولوية العمل المتعدي النفع على القاصر
٩. أولوية العمل الأطول نفعا والأبقى أثراً
١٠. أولوية العمل في زمن الفتن

**١١.** أولوية عمل القلب على عمل الجوارح

**١٢.** أولوية الأصول على الفروع

**١٣.** أولوية الفرائض على السنن والنوافل

**١٤.** أولوية فرض العين على فرض الكفاية

**١٥.** أولوية حقوق العباد على حق الله المجرَّد

**١٦.** أولوية حقوق الجماعة على حقوق الأفراد

**١٧.** أولوية الولاء للجماعة والأمة على القبيلة والفرد

**١٨.** أولوية تغيير الأنفس قبل تغيير الأنظمة

**١٩.** أولوية المعركة الفكرية على المعركة الميدانية.

### فیقهی ئەولەویات

**١.** پێشخستنی چۆنیەتی بەسەر چەندیەتیدا.

**٢.** پێشخستنی زانست بەسەر کرداردا.

**٣.** پێشخستنی تێگەیشتن بەسەر بە تەنها لەبەرکردن و دەرخکردندا.

**٤.** پێشخستنی مەبەستەکان بەسەر ڕوکەش و ڕواڵەتەکاندا.

**٥.** پێشخستنی (الاجتهاد) کۆششکردن ـ بۆ ئەهلی خۆی ـ بەسەر (التقلید) لاسایی و چاولێکردن و شوێن کەوتندا.

**٦.** پێشخستنی ئاسانکاری بەسەر قورسکاریدا.

٧. پێشخستنی کار و کردەوەی بەردەوام بەسەر کاروکردەوەی پچڕاو و بڕاوە.

٨. پێشخستنی کار و کردەوەی سودبەخش بۆ خەڵکی و ئەوانی تر بەسەر کاروکردەوەی سودبەخشی تاکە کەسی.

٩. پێشخستنی ئەو کار و کردەوانەی سود بەخشی درێژ خایەنن و کاریگەرییان زۆر دەمێنێتەوە.

١٠. پێشخستنی کار و کردەوە لە کاتی فیتنە و ئاشوب و ئاژاوەدا.

١١. پێشخستنی کار و کردەوەی دڵ بەسەر کار و کردەوەی ئەندامەکانی دیکەدا.

١٢. پێشخستنی (الأصول) بنچینە و بنەما و شتە بنەڕەتی و ئەساسی و نەگۆڕەکان.

١٣. پێشخستنی فەڕزەکان بەسەر سوننەتەکاندا لەهەموو ڕوێکەوە نەوەك تەنها لە: نوێژ، ڕۆژ،... هتد.

١٤. پێشخستنی فەڕزی عەین بەسەر فەڕزی کیفایە دا.

١٥. پێشخستنی مافەکانی خەڵکی بەسەر ئەو مافانەی تەنها هی خودای گەورەن (بۆ نموونە: قەرز لە پێشترە لە حەج کردن).

١٦. پێشخستنی مافەکانی کۆمەڵ و جەماعەت بەسەر مافەکانی تاکدا.

**١٧.** پێشخستنی پشتگیری و پشتیوانی و سەرخستن و لەگەڵبوونی کۆمەڵ و جەماعەت و گەل و ئوممەت بەسەر قەبیلە و هۆز و تیرە و تاکدا.

**١٨.** پێشخستنی گۆڕینی تاك و دڵ و دەرونی تاکەکان پێش گۆڕینی کۆمەڵگە و وڵات و ڕێکخراو و داموو دەزگاکان.

**١٩.** پێشخستنی شەڕی فیکری بەسەر شەڕەکانی تردا.

***شەڕی فیکری دوو بواری سەرەکی هەیە:**

*المعركة الفكرية: للمعركة الفكرية مجالان أساسيان:

**الأول:** خارج الساحة الإسلامية، مع الملاحدة والمنصِّرين والمستشرقين.

**الثاني:** داخل الساحة الإسلامية نفسها فإن إصلاح الداخل هو الأساس وله الأولوية لا شك فيه أن لدينا تيارات عدة، منها:

**١. التيار الخُرافي: يقوم على أُسس أو خصائص، منها:**

الخرافة في الاعتقاد

**أ-** الابتداع في العباد

**ب-** الجمود في الفكر

**ج-** التقليد في الفقه

**د-** السلبية في السلوك

**هـ-** المسايرة أو المداهنة في السياسة

**٢: التيار الخرافي: يقوم على أُسس أو خصائص، منها:**

أ- الجدلية في العقيدة

ب- الشكلية في العبادة

ج- الظاهرية في الفقه

د- الجزئية في الاهتمام

هـ- الجفاف في الروح

و- الخشونة في الدعوة

ز- الضيق بالخلاف

**٣: تيار الرفض والعنف:**

١. الشدة والصرامة في التزام بالدين

٢. الاعتزاز بالذات اعتزازاً يؤدي إلى نزعة الاستعلاء على المجتمع

٣. سوء الظن بالآخرين جميعاً

٤. ضيق الأفق في فهم الدين وفهم الواقع، وفهم السنن الكونية والاجتماعية

٥. استعجال الأشياء قبل أوانها

٦. المسارعة إلى التفكير بغير تحفظ

٧. اتخاذ القوة سبيلاً إلى تحقيق الأهداف

***شەڕی فکری دوو بواری سەرەکی هەیە:**

**یەکەم:** لە دەرەوەی گۆڕەپانی ئیسلامیدا.

واتە لەگەڵ بێباوەڕ و ئەوانەی خەڵکی دەکەنە مەسیحی و....، وە لەگەڵ رۆژهەڵاتناسەکان.

**دووەم:** لەناوخۆی گۆڕەپانی ئیسلامیدا.

پێویستە ئەوە بزانین کە چاکسازی لەناو گۆڕەپانی ئیسلامیدا ئەساسە و لە هەموو شتێك لەپێشترە، وە گومانی تێدا نیە کە لەلای ئێمە و لەناو ئێمەدا چەند تەوژم و تەیاری جیاجیا هەن لەوانە:

تەوژمی (خورافی): ئەم تەوژمە چەند بنەما و تایبەتمەندییێکی هەیە:

**١.** خورافات لە بیروباوەڕدا.

**٢.** داهێنانی بێ بنەما لە پەرستش و عیبادەتدا.

**٣.** ڕاوەستان و بەرەو پێش نەچوون لە فکر و بیر و عەقڵدا.

**٤.** تەقلید و شوێنکەوتنی کوێرانە و بێ بەڵگە لە فیقە و شەریعەتی ئیسلامیدا.

**٥.** خراپی و باش نەبوون لە خوڕەوشت و مامەڵەدا.

**٦.** دووڕوویی و ماستاوچێتی بێ مەبدەئی لە سیاسەت دا.

*** تەورژمی (الحرفی) دەقی و نەصی و ڕووکەشی و زاهیری: ئەم تەوژمە چەند بنەما و تایبەتمەندییەکی هەیە:**

**١.** موجادەلە و موناقەشەکردنێکی زۆر لە بیروباوەڕدا.

**٢.** ڕووکەشی بوون لە پەرستنشدا.

**٣.** ڕووکەشی و زاهیری بوون لە فیقهدا، واتە گوێنەدان بە مەقاسیدی شەریعە.

**٤.** گرنگدان بە شتە لاوەکی و جوزئی و فەرعیەکان و پشتگوێ خستنی بنەما و (أصول)ە کان.

**٥.** وشکی و دڵڕەقی لە بابەتە ڕووحیەکان، واتە: گوێنەدان بە (تزکیة النفس).

**٦.** زبری و توندوتیژی لە بانگەوازدا.

**٧.** تەسکبیری بەرامبەر بە خیلاف و جیاوازی، قبوڵنەکردنی جیاوازییەکانی بەرامبەر.

*** تەوژمی ڕەتکردنەوە و توندوتیژی: ئەم تەوژمە چەند بنەما و تایبەتمەندییەکی هەیە:**

**١.** توندوتیژی لە پابەندبوون بە ئایینەوە.

**٢.** لووتبەرزی و خۆهەڵکێشان بە (زات) خودەوە، بەشێوەیەك کە سەر دەکێشێ بۆ خۆفەڕزکردن و خۆبەگەورە دانان بە سەر کۆمەڵگە و خەڵکی ترەوە.

**٣.** گومانی خراپ بردن بە خەڵکی دیکە جگە لە خۆیان.

**٤.** تەسك بیرکردنەوەی ئاینی و واقیعی و نەبوونی دووربینی بۆ ڕووداو و پێشهاتەکان و بۆ داهاتوو، وە تەسکبیرکردنەوە لە سونەتە گەردوونی و کۆمەڵایەتیەکان.

**٥.** پەلەکردن بۆ شتەکان و ئامانجەکان پێش ئەوەی کاتیان هاتبێ و هەلومەرجیان ڕەخسابێت.

**٦.** پەلەکردن لە بە کافردانانی خەڵکی بە بێ سڵکردنەوە لە هیچ شتێك.

**٧.** بەکارهێنانی هێز وەك ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان و بەدیهێنانیان.[١]

تەوژمی وەسەتی و میانڕەویش تەواو تەواو پێچەوانەی ئەمانەیە و لە هەموویاندا ناوەڕاستەکەی گرتووە و ناوەندگیرە.

---

(١) في فقه الأولیات، یوسف القرضاوي.

## (٩٣) یاسا و بنەما بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕاجیایی (ئیختیلاف) و موخالیف و زانایان و مەزاهیب و توراس و کەلەپووردا

مامەڵە لەگەڵ ڕاجیایی (ئیختیلاف) و زانایان و مەزاهیب و توراس و کەلەپوور و ئەدەبی ئیختیلاف و ڕاجیایی زانستێکە و حەق وایە بە دەرس بخوێندرێت، بەتایبەت لەئێستادا کە بە بەرنامە کار لەسەر زەق کردنەوەی ئەم بابەتانە دەکرێت و دەخزێندرێتە ناو سۆشیال میدیا و خەڵکی عەوام، ئێمە لێرەدا ٩٣ بنەما و یاسا دەخەینەڕوو بۆئەوەی مامەڵەیەکی جوان و بەجێ لەگەڵیاندا بکەین.

### (١) الْحَذَرَ مِنْ سُوءِ الظَّنِّ

یەکێك لە بنەماکان بریتییە لە ئاگاداربوون و دوورکەوتنەوە لە بەدگومانی و گومان بردنی خراپ بە بەرامبەرەکانمان، چونکە بەدگومانی و گومان بردنی خراپ وا دەکات کەس متمانەی بەکەس نەبێت و کەس پشت بەکەس نەبەستێت و کەس یارمەتی کەس نەدات و کەس نزیکایەتی و هاوەڵایەتی و دۆستایەتی یەکتر نەکات، لەدوایشدا ئوممەت هەمووی لێك دەترازێت و کەس ئارامی دەروونی ڕۆحی بەرامبەر یەکتری نامێنێت، ئەوە مانای

ئەوە نییە ئێمە فەقیر حاڵ بین و دڵ ساف و سەتحی بین بەرامبەر هەموو کەسێك، نەخێر، ئەوەی ئێمە باسی دەکەین بەرامبەر برا و خوشکە پاك و ڕاستگۆ و دڵسۆزەکانە، ئەگەرنا هەندێ جار گومان نەبردن دەبێتە ساویلکەیی و فێڵت لێ دەکرێت.

## (٢) التَّجَرُّدُ مِنْ الْهَوَى

یەکێکی تر لە بنەماکان بریتییە لە خۆ داڕنین لە هەوا و مەیلی نادروستی نەفسی، گەورەترین نەخۆشی ئەم ئوممەتە خۆ دانەڕنینە لە هەوا و مەیلی نادروستی نەفسی، جاری وا هەیە کەسێك هەر لەخۆیەوە دەڵێت: کەیفم بە فڵانە کەسە نایەت!!! ئەمە هەوایە، ئەگەرنا زۆربەی هەرە زۆری ئەم ئوممەتە جیاوازی ئوسوڵی نییە، ئەوەی هەیە بەشی هەرە زۆری شتی نەفسی و هەواییە! ئەگەرنا بۆ دەبێ لەسەر ئەم شتە جوزئی و فەرعی و بچووکانە ئاوا لێك بترازێین.

## (٣) الْاِبْتِعَادُ عَنِ التَّكْفِيرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دووربوون لە تەکفیر، چونکە تەکفیری نابەجێ (کە زۆربەی زۆری لەم جۆرەیە) کاریگەری زۆر خراپی هەیە، لەوانە:

**١.** تەسك كردنەوەی بازنەی موسڵمانان.

**٢.** بڵاوبوونەوەی ڕق و كینە و دووبەرەكی و دوژمنایەتی و شەڕ و وێرانكاری و دووربوون لە یەكتری.

**٣.** فراوانكردنی بازنەی بێباوەڕان.

زۆرجار لەسەر شتێكی جوزئی و ئیختیلافێكی فەرعی یەكتر تەكفیر دەكرێت و یەكتر لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەبەنەدەر، كە ئەمەش ئەوپەڕی ناحاڵی بوونە لە ئیسلام و ئیمان و ڕاجیایی و ئیختیلاف.[١]

---

(١) تەكفیر: تەكفیر دەستەواژەیەكی دینیە بە واتای بەكافردانان و كافركردن دێت.

### بنەماكانی تەكفیر

تەكفیر یەكێكە لە هەستیارترین و مەترسیدارترین بابەتەكان، بۆیە زانایان زۆر لەم بابەتەیان كۆڵیوەتەوە و توێژینەوەی ورد و قووڵیان بۆی كردووە، ئێمەش لێرەدا چەند بنەمایەك لە بنەماكانی تەكفیر باس دەكەین:

١. هەركەسێك حوكمی موسڵمانبوونی لەسەر چەسپا بێت و موسڵمان بوونەكەی ئاشكرا و ڕوون بێت ئەوا ئەو وەسفەی لەسەر لاناچێت مەگەر بەڵگەیەكی یەقینی و بێگومانی بێت ئەو وەسفەی لەسەر لاببات.

٢. موسڵمان بە كوفری گەورە نەبێت لە ئیسلام دەرناچێت، كوفری بچووك موسڵمان دەرناكات لە ئیسلام.

٣. تەكفیر حوكمێكی شەرعییە هەر بۆیە بەڵگەیەكی قەتعی نەبێت ناچەسپێت.

---

٤. لە تەکفیری دیاریکراودا پێویستە مەرجەکان بێنەجێ و ڕێگرییەکانیش نەمێنن.

٥. تەکفیر پێویستی بە ئیقامە حوججە هەیە و بەبێ ئیقامە حوججە ناچەسپێت.

٦. گوناه و تاوان موسڵمان ناخەنە دەرەوە لە ئیسلام، بەڵکوو بەس پێی گوناهبار دەبن.

٧. پێویستە گومانی باش بە برا و خوشەکەکانمان ببەین و تەکفیر نەکەینە ئامانج.

٨. تەکفیر حوکمێکە نابێت هەموو کەسێك پێی هەستێت.

## ڕێگرییەکانی بەردەم تەکفیر

١. نەزانی

٢. هەڵەکردن

٣. تەئویل

٤. زۆرلێکردن

٥. تەقلید

واتە ئەگەر کەسێك بە نەزانی تووشی کوفر بوو و نەشی توانیبوو فێرببێت، ئەوە تەکفیر ناکرێت، یان بەهەڵە کەوتە کوفرەوە، یان ئەهلی تەئویل بوو و تەئویلی کرد و کەوتە کوفرەوە، یان زۆری لێکرا بۆئەوەی کوفر بکات نەشی توانی خۆ بۆ ئازارەکانی بگرێت، یان بە تەقلید کەوتە کوفرەوە، ئەوا لەم

حاڵەتانەدا تەکفیری ئەم کەسانە ناکرێت و نابێت تەکفیر بکرێن.

### توندڕەوی و ڕەهەندەکانی

توندڕەوی تەوژمێکی تازە نییە و بەدرێژایی مێژوو بوونی هەبووە، هەروەها تایبەت نییە بە بیر و فکر و ئایینێکی دیاریکراوەوە، بەڵکوو شتێکی گشتییە، لە ناو مێژووی موسڵمانانیشدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەواریج...، تەوژمە توندڕەوەکان جۆریان زۆر زۆرە، بە درێژایی مێژوو بە دەیان و سەدان تەوژمی توندڕەو هەبووە کە کەسیان بەکەس ڕازی نەبووە و زۆرێکیان یەکتریا تەکفیرکردووە.

### * سیما و بیرو ڕاکانی تەوژمی توندڕەوی:

١. تەکفیر، تەکفیر لای ئەو تەوژمە زۆر سادە و ئاسانە، هەرکەسێك تۆزقاڵێك لابدات، لایان ئاسانە تەکفیری بکەن. بۆیە لای ئەوان ئەوانەی گوناهی گەورە دەکەن هەموویان کافرن، یان دەستەڵاتدارانی غەیری خۆیان تەکفیر دەکەن، ئەوەی لەژێر سایەی ئەو دەستەڵاتانەش بێت تەکفیریان دەکەن چونکە دەڵێن ڕازین بەوان، هەتا کاتی خۆی خەواریجەکان ئیمامی عەلی و عوسمان و معاویە و عائیشە و تەڵحە و زوبێر و هەموو ئەوانەشی لەگەڵیان بوون تەکفریان دەکردن.

٢. زۆرێکیان هیچ ئیعتیبارێك بۆ زانایان دانانێن، هەتا هەیانە شافعی و حەنەفی و چەندانی تریشیان پێ کافرن.

٣. گومان بردنی خراپ بە هەموو خەڵکی جگە لە خۆیان

٤. واقیعی نەبوون

---

٥. دابڕان لە گۆمەڵگە

٦. پەلەکردن لە شتەکاندا و بەکارنەهێنانی پلەبەندی

٧. بەکارهێنانی هێز بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان

٨. قبووڵ نەکرنی بیروڕای بەرانبەر

٩. بێبەزەییبوون

١٠. کەمی زانست و زانیاری، بۆیە زۆرێکیان شارەزاییێکی وایان لە زانستی شەرعیدا نییە.

١١. زاهیریبوون لە تێگەیشتنی دەق

١٢. بڕوانەبوون بە گفتوگۆ

١٣. بڕوایان وایە بەس ئەوان لەسەر حەقن و خەڵکی هەموو یان کافرن یان گومڕان یان نەزانن.

١٤. بەکارهێنانی هێز و زەبر و زەنگ بۆ چەسپاندنی بیروڕاکانیان

١٥. زاهیریبوون لە عیبادەت و پەرستنشدا

١٦. وشکی و توندی لە بانگەوازدا

١٧. گرنگیدانی لە ڕادەبەدەر بە جوزئیات و شتەلاوەکی و فەرعییەکان

١٨. بەسوك سەیریکردنی غەیری خۆیان و خۆ لێ گۆڕان و لەخۆباییبوون

١٩. ڕەچاونەکردنی فیقهی ئەولەویات

٢٠. مەقاسیدینەبوون و نەخوێندنەوەی مەبەستەکانی شەریعەت.

٢١. پەراوێزخستن یان حیساب نەکردن بۆ عەقڵ و ئەزموون و سیاسەی شەرعی.

## هۆکارەکانی توندڕەوی

١. تێگەیشتنی نادروست و هەڵە

٢. نەزانی و بێئاگایی لە قورئان و سوننە

٣. نەزانی و بێئاگایی لە ڕووحی ئیسلام و مەقاسیدی شەریعە

٤. نەزانی و بێئاگایی لە پێناسەی ئیمان و ڕوکنەکانی

٥. نەزانی و بێئاگایی لە جۆر و ئاستی خەڵك

٦. پەلەکردن و هەڵپەکردن و هەڵەشەیی

٧. نەخوێندنەوەی باردۆخ و ژینگە و کات و شوێنەکان

٨. دەمارگیری و تەعەسووب

٩. تێکچوونی باری دەروونی

١٠. هەڵچوون

١١. پەروەردەی نادروست

١٢. پەرتووك و نووسراوی توند و نامەنهەجی و پەڕگیر

١٣. نائومێدی و بێهیوابوون

١٤. پیلانگێڕی دوژمنانی ئیسلام و دەستی دەرەکی و هۆکار و هاندانی دەرەکی

١٥. نەبوونی کیان و دەوڵەتی سەربەخۆ

١٦. ڕاگەیاندن و ئاڕاستەکردنە نادروستەکانی

١٧. بانگخوازە ناتێگەیشتووەکان

١٨. ستەم و ستەمی سەرکردەکان

١٩. تێکچوونی پەیوەندی دەستەڵاتداران و گەل

٢٠. سوکایەتی کردن بە ئیسلام و بریندارکردنی هەست و سۆزیان

٢١. تێکچوونی بارودۆخی ئابووری و تەقینەوی کۆمەڵگە لە دژی

٢٢. جێبەجێ نەکردنی ئەرکی سەرشانیان لەلایەن هەندێك لە زانایان و بانگخوازان و نووسەران

٢٣. شکستپێهێنانی پرۆسە سیاسییەکان و دوورخستنەوەی ئەوانەی بە دەنگی خەڵك هاتوون و هەڵبژێردراون.

٢٤. تەئویل و تەفسیری لادەرانە بۆ دەقەکان

٢٥. دەقگەرایی و زاهیریبوون

٢٦. کۆنەکردنەوەی دەقەکان بەیەکەوە

## کاریگەرییەکانی توندڕەوی

١. تێکدانی ئەمن و ئاسایش

٢. لەناوبردنی برایەتی و خۆشەویستی

٣. کاولکاری

٤. ستەم و ستەمکاری

٥. هێنانەدی ئاواتی دوژمنان

٦. کوشت و کوشتار

٧. هەتیو خستن و بێوەژن خستن

٨. تێکدانی شیرازەی تاك و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت و سیاسەت

٩. ناشیرین کردنی ئایین

## چارەسەری توندڕەوی

١. تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست بۆ ئیسلام

٢. خوێندن و خوێندوەی عەقیدە و بیروباوەڕێیکی پاك و دوور لە زیادەڕەوی و کەم ڕەوی

٣. بەدواکەوتنی مەنهەج، نەك کەس

٤. زاهیرینەبوون لە تێگەشتنی دەق

٥. وریابوون و حەزەر کردن و بیرکردنەوە لە دەرەنجامە خراپەکانی توندڕەوی و تەکفیر

٦. ڕوانینی میانڕەوانە بۆ توراس و کەلەپور و قسە و مەزهەبی زانایان و بەپیرۆز سەیرنەکردنیان، لە هەمان کاتدا سود وەرگرتن لێیان و دانەبڕان لێیان، واتە نە بە پیرۆز سەیریانکەی نە بە سووك و کەم، بەڵکوو بەردەوام وەك سەروەتێکی گەورە لێیان بڕوانی و سوودیان لێوەرگری، بەڵام لێت نەبن بە ئەسڵی دین و خەڵکیان لەسەر تەکفیرکەی.

٧. واقیعیبوون، نەك خەیاڵیبوون

٨. خۆت لێ نەبێتە حاكم و قازی و بڕیارِ لەسەر خەڵك بدەی، چونكە تۆ یان فێرخوازی یان بانگخوازی یان زانا، كەواتە دەبێت ئەم چەمكانە ڕەچاوبكرێن و هەرچی ڕاستبۆە خۆی لێ نەبێت بە قازی و خەڵك تەكفیر كات، زۆر جار هەندێك گەنج دوو وشە عەرەبی دەزانن و یەك دوو نامیلكەیان خوێندۆتەوە گوێیان لە یەك دوو وتار بووە دێن خەڵك و زانا و بانگخوازان تەكفیر دەكەن!!! بەڕاستی كارەساتە.

٩. گرینگیدانێكی قووڵ بە سیاسەی شەرعی و هێڵە گشتییەكانی شەریعەت و ئیسلام و بەقوربان نەكردنی كلیاتی شەریعەت بۆ جزئیات.

لەكۆتاییدا تەوژمی تەكفیری بە درێژایی مێژوو لە غەیریماڵوێرانی هیچی تری پێنەبووە، بۆیە پێویستە لە كرۆكی ئیسلام تێبگەین و خۆمان لە شتێك نەدەین كە كاری ئێمە نییە، سەدان كار و خزمەت لەولاوە بێناز كەوتووە، بەڵام دەچن پێخەی تەكفیر دەگرن!!!

با ئەوەشمان لەبیر نەچێت، زۆر جار سەرچاوەی توندڕەوی غەیری ئیسلام و موسڵمانە، جا یان ئەوان پاڵنەرن یان پشتگیری دەكەن یان زۆرجار بە ئەنقەست گروپە توندڕەوەكان دروست دەكەن بۆ مەرام و مەبەستی خۆیان، زۆرجاریش گەورەترین خزمەتە بەوان.

تێبینی: زیاتر مەبەستمان ئەو توندڕەوییە بوو كە بەناوی ئیسلامەوە دەیكەن، ئەگەرنا وەك وتمان توندڕەوی تایبەت نییە بە ئایین یان بیرێكی دیاریكراوەوە، بەڵكوو گشتییە، ئەگەرنا ئەگەر باسی توندڕەوی غەیری ئیسلامیش بكەین ئەوە زۆر زیاترە و ئەوەی ئەوان كردویانە بەدرێژایی مێژوو زۆر زۆر زیاترە.

## (٤) تَوْقِيرُ الْعُلَمَاءِ بَدَلَ تَحْقِيرِهِمْ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕێزگرتن لە زانایان لەبری سوکایەتی پێکردنیان، لەناو موسڵماناندا سوکایەتی کردن بەزانایان بۆتە دیاردە! بۆ دەبێ ئەگەر زانایێك لەگەڵ ڕاکەی تۆ نەبێت بێی سوکایەتی پێبکەی و بیشکێنی و لەبەرچاوی خەڵك سووکی بکەیت؟! تەنها لەبەر ئەوەی لە جەماعەت و حیزبەکەی تۆ نییە؟! تەنها لەبەر ئەوەی ڕاجیاییتان هەیە؟! هەتا خۆمان ڕێز لە زانایانمان نەگرین با بەتەما نەبین خەڵکی تر ڕێزیان لێبگرێت و حیسابیان بۆ بکات، لە ئەنجامیشدا ئوممەت لاواز دەبێت و مەرجەعییەت نامێنێت و ...، وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین.

---

ئەوەی گرینگە لێرەدا ئەوەیە ئێمە لە مێژوودا نەژێین بەڵام سوودی لێببینین، بۆ نموونە خەواریج ڕێبازێکی سیاسی کەلامی فکری عەقیدەیی سەربازی بوون و تێپەڕین، بەڵام لە هەموو سەردەمەکاندا بەشێوە و شێواز و سیما و ناو و ڕەنگی جیاواز سەرهەڵدەدەنەوە، کە پێویستە بیانناسین و مامەڵەی هەستیاریان لەگەڵدا بکەین، ئەگەرنا وەك خودی ناوەکە خەواریج کۆمەڵە گروپێك بوون و تێپەڕین.

## (٥) إِظْهَارُ مَحَاسِنِ الْإِسْلَامِ مِنْ كُلِّ الْجَوَانِبِ التَّشْرِيعِيَّةِ وَالْعَقَدِيَّةِ وَالْعِبَادِيَّةِ وَالسِّيَاسِيَّةِ وَالْاِقْتِصَادِيَّةِ وَ ... بَدَلَ الاِشْتِغَالِ بِالْمخْتَلَفِ فِيْهِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دەرخستنی جوانییەکانی ئیسلام لە هەموو لایەنەکانی تەشریعی و یاسای و عەقیدەی و فیکری و فەلسەفەیی و پەرستش و سیاسی و ئابوری و .... لەبری سەرقاڵبوون بە ڕاجیایی لەسەرەکان، چونکە کە ئەمە کرا دوو ئامانجی زۆر گەورە و سەرەکی دەپێکرێت:

١. پتەوکردنی بیر و باوەڕی موسڵمانان و چاندنی ڕۆحی شانازی بەخۆوەکردن و دووربوون لە داڕوخان و هەست بەکەم کردن.

٢. وەڵامدانەوەی بەرامبەرەکان.

کەواتە هەم بەرگرییە هەم هێرش.

## (٦) الصَّدَاقَةُ وَالْمَحَبَّةُ وَالوِئَامُ وَالاِتِّحَادُ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و ئاشتی و ئاشتەوایی و یەکگرتوویی

چونکە بەمە چەند ئامانجێك دەپێکرێت:

**١.** لەگەڵ یەکبوون و یەکگرتوویی.

**٢.** زاڵبوون بەسەر دوژمندا.

**٣.** توانا هەبوون بۆ کردنی هەر کارێك کە بتەوێت.

برایەتییو یەکگرتوویی و هاوڕێیەتی و خۆشەویستی شتێکی زۆر زەرور و پێویستە و لە نەبوونیدا گەورەترین کارەسات دەخولقێت هەروەك ئێستا دەیبینین بە چاوی خۆمان کە چیمان بەسەر هاتووە، لەگەڵ زۆری ژمارەمان بەڵام بەردەوام ژێر دەستە و ستەم لێکراوین.[١]

---

(١) ئەو ئایەتەمان بەسە بۆ هەستانەوە و سەرکەوتن : (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) آل عمران: ١٠٣ واتە: هەر هەمووتان بە توندی دەستبگرن بە بەرنامە و ئاینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن.

ئەو یاسا قورئانییە یەکێکە لەو یاسایانەی کە موسوڵمانان بە تەواوی پشتگوێیان خستووە و تەنها وەك خوێندنەوە دەیخوێننەوە، بەڵام لە بواری کردەییدا بە تەواوی فەرامۆشیان کردووە، بۆیەش سەرەنجامان بە ئەمڕۆ گەیشتووە، کەنزیکەی دوو ملیار مسوڵمان هەیە لەگەڵ نزیکەی (٦٠ ) دەوڵەتی مسوڵمان، وە(٧٠٪) بەرهەمی کانزایی و ...، لەنێو وڵاتانی مسوڵمان دەردەهێنرێت و دەنێردرێت بۆ وڵاتانی تر، بەڵام ئەوەش حاڵەکەمانە ئەویش بەهۆی جێبەجێ نەکردنی  ئەم یاسا قورئانییە.

## ڕێگریەکانی بەردەم یەکگرتوویی:

ڕێگریەکانی بەردەم برایەتی  و یەکگرتوویی و تەبایی

١- خۆخۆی و ئەنانیەت.

٢- دووربوون لە یەکتری و نزیك نەبوونەوە لە یەکتری.

٣- حیساب نەکردن بۆ بیر و ڕای یەکتری.

٤- حەزی دەرکەوتن و ڕەشکردنەوەی ئەوانی تر.

٥- حەسادەت.

٦- ڕیا.

٧- ڕق و کینە.

٨- هەستی تۆڵە کردنەوە.

٩- خیانەت.

١٠- گومان بردنی خراپ بە یەکبری.

١١- زمان زبری.

١٢- ڕووگرژی.

١٣- ستەم لە یەکتر کردن.

١٤- غەیبەت و بوهتان کردن.

١٥- تەکەبوور و فیز و خۆ بە زلزانی.

١٦- پەیمان شکێنی.

١٧- حیساب نەکردن بۆ هەست و شعوری یەکتری.

## (٧) الْإِنْصَافُ وَالتَّسَامُحُ بَدَلَ التَّعَصُّبِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ئینساف و لێبوردەیی لەبری دەماگیری و نەبوونی لێبوردەیی و ئینساف، دەمارگیری مەزهەبی، تائیفی، حیزبی،.... هەبوونی دەمارگیری ئەو ئوممەتەی بە

---

١٨- موناقەشە و جەدەلی بێ سوود.

١٩- گەڕان بەدوای عەیبی یەکتردا و فەزح کردنی یەکتری.

٢٠. پێ خۆشبوونی شکستی بەرامبەر.

٢١- ئینکاری و نکوولّی لە ڕاستیەکانی ئەوانی تر و حەقبوونیان.

٢٢- نەگەڕانەوە و پەشیمان نەبوونەوە و داوای لێبوردن نەکردن دوای زانینی هەڵەکان.

٢٣- تێکەڵکردنی شتی شەخسی و کەسی و تایبەت بە شتە گشتیەکان.

٢٤- بەخۆسەرسام (موعجەب) بوون و حیساب نەکردن بۆ بەرامبەر.

٢٥- گاڵتەکرن بە بەرامبەر.

٢٦- دژایەتی و دوژمنایەتی بەرامبەر.

٢٧- دان نەنان بە چاکەی بەرامبەر.

٢٨- وشکی و ڕەقی و تەبیعەت ناخۆشی.

٢٩- تەعەسسوب و دەرماگیری.

٣٠- خۆ جیاکرنەوە لە خەڵکی.

هەلاکدا، چونکە ئینساف نەما حەق بزردەبێت، کە لێبوردەییش نەما برایەتی و لەگەڵ یەکبوون نامێنێت، کە دەمارگیریش هەبوو ئوممەت لێك هەڵدەوەشێت وەك ئەوەی کە ئێستا دەیبینین.[١]

## (٨) التَّعَامُلُ مَعَ الْقَوْلِ بَدَلَ الْقَائِلِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکانی بریتییە لە مامەڵەکردن لەگەڵ قسە و وتە نەوەك قسەکەر، وەك وتراوە: (اُنْظُرْ إِلَى مَا قِيلَ وَلاَ تَنْظُرْ إِلَى مَنْ قَالَ)، واتە: بڕوانە ئەوەی کە وتراوە نەوەك ئەوەی کە کێ گوتویەتی، چونکە ئەگەر ڕوانیتە قسەکەرەکە حەتمەن شتێکی دەروونی تێکەڵ دەبێت و زۆر جار کە حەقیشە بەڵام ئامادە نیت ملی بۆ بدەی تەنها لەبەر ئەوەی کەسێك وتویەتی کە کەیفت پێی نایەت یان لەگەڵی نیت یان لە حیزب و پێڕ و مەزهەبی تۆ نییە، تەنانەت ئەوە پەڕیوەتەوە بۆ کتێبیش، زۆر کەس و لایەن هەن

---

(١) ئەمە چۆن دەکرێت:

١. تێگەیشتنی ڕاست و دروست.

٢. پەروەردە و فێرکردنی ڕاست و دروست.

٣. سەنتەربوونی حەق.

٤. کراوەیی بوون و دانەخراویی.

٥. گەڕان بەدوای حەق و شەرم نەبوون بە گەڕانەوەی بۆلای دوای زانین.

سەیری ناوەڕۆکی کتێب ناکەن بەڵکو سەیری خودی نووسەرەکە دەکەن! بۆیە لایان ئاساییە نەیخوێننەوە یان بیسووتێنن!

## (٩) التَّعَمُّقُ وَالدِّقَّةُ فِي فَهْمِ الإِسْلَامِ بَدَلَ السَّطْحِيَّةِ وَالظَّاهِرِيَّةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە قوڵی و وردبینی لە تێگەیشتنی ئیسلام لەبری ڕووکەشی بوون و زاهیری بوون.[١]

هەتا لە زاهیرییەت و ڕووکەش بینی دوور نەکەوینەوە ناگەین بە ڕۆحی ئیسلام و سەرکەوتنی ئوممەت، ئوممەت هەتا وەك ئێستا زاهیری بێت لە تێگەیشتنی ئیسلام و واقیع و بارودۆخ و ژینگە

---

(١) بنەماکانی قووڵ تێگەیشتن:
١. خوێندنەوەی فراوان و زۆر و قووڵ و وردبینانە.
٢. نەبوونی دەمارگیری.
٣. خوێندنەوەی بارودۆخ و ژینگە و دەوروبەر و واقیع.
٤. زانستێکی هەمە لایەنە و فراوان.
٥. نەبوونی بەرژەوەندی شەخسی و دونیایی.
٦. دەرگا واڵاکردن بۆ تەجدید و نوێگەریی و خوێندنەوەی نوێی و گونجاو و جوان و باش.

و ... حاڵی لە ئێستا باشتر نابێت، مەبەستمان زیاتر ڕووکەشی نەبوون و زاهیری نەبوونە لە تێگەیشتنی دەق (نص).

هەر ئەم سەتحی بوون و ڕووکەش بینیەیە وایکردووە کە نەتوانین بەباشی مامەڵە لەگەڵ ڕاجیایی و ئیختیلاف و موخالیفەکانمان بکەین.

## (١٠) الْاِبْتِعَادُ عَنِ الْعَدَاوَةِ وَالْخِصَامِ وَالتَّفَرُّقِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دووربوون لە دوژمنایەتی و دووبەرەکی و کێشمەکێش و پەرتەوازەیی، چونکە بەم شێوازە هیچ شتێ ناکرێت، بشکرێت هەرەس دێنێت و کورت مەودا دەبێت، بۆیە بەهێزترین پاڵنەر و بنەما بۆ ڕاست بوونەوەی ئوممەت بریتییە لە دەستهەڵگرتن لە دوژمنایەتی و دووبەرەکی و کێشمەکێش و پەرتەوازەیی، چونکە دڵەکان لێك دووردەکەونەوە و ڕیزەکان درز دەیانگرێت و دەستەکان شەل دەبن و ئیرادەکان لاواز دەبن و نییەتەکان خەوش دەیانگرێت.

## (١١) الْاِنْتِمَاءُ لِلْمَنَاهِجِ بَدَلَ الْأَشْخَاصِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ئینتیمابوون بۆ مەنهەج و بەرنامە لەبری ئینتیمابوون بۆ شەخس، کە ئوممەت ئینتیمای بۆ مەنهەج هەبوو دەبێتە ئومەتێکی مەنهەجی و زانستی و حەق سەنتەری، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر وانەبوو دەبێتە ئوممەتێکی شەخسپەرست و دواکەوتوو و لە مێژوودا ژیاو، بۆ ئەوەی ئوممەت پێش بکەوێت پێویستە دەست هەڵگرێ لە شەخسپەرستی و بگەڕێتەوە بۆ مەنهەج و بەرنامە.[1] لە ڕاجیایی و ئیختیلافیشدا ئەگەر مەنهەج سەنتەر بوو بەدڵنیاییەوە سەرەنجامەکانی بەرهەمدار دەبێت، بەپێچەوانەی شەخ سەنتەری.

---

(١) ئەوەش بەچەن شتێك دەکرێت:

١. پەروەدەی خێزانی و قوتابخانە و هەموو کایە مەعریفی و زانستییەکان جەخت لەسەر ئینتیمابوون بۆ حەق و مەنهەج و بەرنامە بکەنەوە.

٢. بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری.

٣. حەق سەنتەری.

٤. نەهێشتنی مەیلی بەرژەوەندی خوازانە.

## (١٢) التَّرْكِيزُ عَلَى الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لەوەی کە ئێمە کۆببینەوە و خڕببینەوە لە دەوری ئەو شتانەی کۆدەنگییان لەسەرە وە خۆمان دوور بگرین لە لەدڵگرتنی شتە ڕاجیایی و جیاوازی لەسەرەکان.

بۆ نموونە هەموومان باوەڕمان بە خودا و پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام و قورئان و ڕۆژی دوایی و ئەخلاقی جوانی و ... هەیە، کەواتە با لە دەوری ئەوانە کۆبینەوە و دوور بکەوینەوە لە شتانێك کە جیاوازی و ڕاجیاییان لەسەرە و کەس پێی لە دین دەرناچێت و هەرگیزیش کۆدەنگییان لەسەر دروست نابێت.

## (١٣) الْحِكْمَة

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گەڕانەوە بۆ حیکمەت و دانایی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحل: ١٢٥

واتە: بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی (بۆ هەندێك) و ئامۆژگاری جوان و بەجێ، (بۆ هەندێکی تر) و گفتو گۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە.

حیکمەت ونبووی موسڵمانە لەهەر شوێنێك بیبینێت لە هەموو کەسێك لەپێشترە کە ڕەچاوی بکات.

بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ڕاجیاییشدا هەتا ڕەچاوی حیکمەت بکرێت هێشتا کەمە، چونکە ئەگەر بەرامبەر ڕاجیاییەکان حیکەت نەبوو ئەوە ئەم ڕاجیایی و ئیختیلافە دەبێتە نیقمەت و دەردەسەری و بەڵاو بۆ گشت لایەك و زۆرجاریش دووبەرەکی و کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوە دەبێتە فیتنەیەکی گەورە و ئاسایشی کۆمەڵایەتی و وڵات دەکەوێتە مەترسیەوە.

## (١٤) التَّبْشِيرُ بَدَلَ التَّنْفِيرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە مژدەبەخشی و مژدەدەری لە بری دوورخستنەوەی خەڵکی و ڕەواندنەوەیان، چونکە مژدەبەخشی و نەرمونیانی گەورەترین کاریگەری لەسەر دەروون و عەقڵ و فکر و کردەوەی تاك و کۆمەڵگە دەبێت و وایان لێدەکات هەمیشە گەشبین و دڵخۆش بن بەم ئایینە، بەڵام ئەگەر وانەبوو بە دڵنیاییەوە ڕقیان لێی دەبێتەوە و لێی دەڕەونەوە و لێی دووردەکەونەوە و حەزیان پێی نایەت، ئەگەر بیشیکەن بە دڵ و ڕۆحەوە نایکەن و زۆر زوو لێی بێزا دەبن.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: ((بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا))؛ متفق علیه. واتە: مژدەدەربن و خەڵکی مەڕەوێننەوە و دوورمەخەنەوە.

بۆیە پێویستە لە بابەتە ڕاجیایی و ئیختیلاف لەسەرەکانیشدا موژدەدەر و نەرموونیان بین نەوەك توونڕەو و دڵڕەق و وشك.

## (١٥) الْإِحْسَاسُ بِالْمَسْؤولِيَّةِ (بِأَنْوَاعِهَا)

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە هەست کردن بە بەرپرسیارییەتی بە هەموو جۆرەکانییەوە.

ئەگەر تاکەکانی ئوممەت و زانایان و بانگخوازان هەستابان بە ئەرکەکانیان بەرامبەر بەرپرسیارییەتی و بەرپرسیاریەتییان هەڵگرتبا ئەوە بە دڵنیاییەوە بەمڕۆ نەدەگەیشتین. چونکە هەموومان بەرپرسارین بەرامبەر خۆمان و خەڵك و خودا و وڵات و ئوممەت و ... .(١)

بەرپرسیاریەتیش بە مانایەکی تەسکتر مەبەستمان لێی بەرپرسیاریەتیە بەرامبەر زانایان و دین و ڕاجیایی و ئیختیلاف و لێکەوتەکانیان.

---

(١) پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: {أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ} (متفق عليه).

## (١٦) تَقْدِيمُ التَّرْبِيَةِ عَلَى التَّعْلِيمِ وَالْجَمْعُ بَيْنَهُمَا

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە پێشخستنی پەروەردە بەسەر فێرکردندا و کۆکردنەوەی هەردووکیان بەیەکەوە، ئەگەر بەس بمانەوێت خەڵکی فێری زانست بین و پەروەردەیان نەکەین ئەوە ئوممەت و شارستانییەکی فوول ماددی بنیات دەنێین و حاڵی دەروونی و فیکری و ڕۆحی و کۆمەڵایەتیمان لە ڕۆژئاوا باشتر و جوانتر نابێت ... .

ئەسڵ وایە پەروەردە و فێرکردن بەیەکەوە بن و لێك دانەبڕێن، خۆ ئەگەر هەر یەکێکت پێکرا پەورەدەکە هەڵبژێرە، چونکە ئەو کات هەر نەبێت ئەو مرۆڤە لەسەر مرۆڤبوونی خۆی دەمێنێتەوە نابێت بە ئاژەڵێکی لەخۆبایی و سەرکەش و بەخۆنازیو و ... .

ئەگەر قوتابیان و ئەهلی عیلم پەروەردەبکرێن ئەوە بەدڵنیاییەوە لە کاتی ڕاجیایی و ئیختیلافیشدا تەواوی بنەماکان دەپارێزن و بەشێوازێکی ئەخلاقی و ئەدەبی بەرز مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن.

## (١٧) اِحْتِرَامُ الْعُلَمَاءِ وَأَقْوَالِهِمْ بَدَلَ تَقْدِيسِهِمْ أَوَ تَبْخِيسِهِمْ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕێزگرتن لە زانایان و ڕاو بۆچونەکانیان لەبری بە سووك سەیرکردنیان یان پیرۆزکردنیان.

سێ هەڵوێست هەیە دەربارەی زانایان و ڕاو بۆچونەکانیان :

١. ڕێزگرتنیان

٢. سووککردنیان.

٣. پیرۆزکردنیان.

هەڵوێستی ڕاست دەربارەیان نە سووککردنە و نە پیرۆزکردن، بەڵکو ڕێزگرتنە.

## (١٨) عَدَمُ الْحُكْمِ عَلَى الْمُقَابِلِ وَالْمُخَالِفِ قَبْلَ الاِسْتِقْرَاءِ وَالتَّيَقُّنِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە حوکم نەدان و بڕیاڕ نەدان لەسەر هیچ کەس و زانا و بۆچوون و مەزهەبێك هەتاوەکو بەدواداچونێکی تەواو و ورد و قوڵی بۆ دەکرێت، واتە کاتێك

دەتەوێت حوکم و بڕیار لەسەر کەسێك، زانایێك، یان نووسەرێك بدەی پێش هەموو شتێك دەبێت (استقراء) بکەی، بەدواداچوونی تەواو تەواوی بۆ بکەی و بگەیە پلەی دڵنیایی ئینجا حەق بە خۆت بدەی قسەی لەسەر بکەیت یان لەسەری بنووسی.

یان دەتەوێ زانـــایێك یان نووســـەرێك هەڵســەنگێنی دەبێ بەدواداچوونی تەواوی بۆ بکەی و گەڕانێکی ورد بکەی بۆ نووسین و کتێبەکانی، بە چەند لاپەڕەیەك ئەوە دەرناکەوێت، نەوەك هەر ئەمە بەڵکو زۆر جار پێویستە خوێندنەوەی گشتی و گشتگیر بکەی بۆ هەموو کتێب و نووسین و وتەکانی و قوناغی ژیانی و ئەو بارودۆخ و ژینگە و کات و شوێنەی کە ئەمەی تێدا نووسیوە و وتووە.

## (١٩) عَدَمُ انْتِهَاكِ حُرُمَاتِ الْآخَرِينَ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە نەشکاندنی شکۆ و سنووری ئەوانی تر، ئوممەت تاك بە تاکی لەسەری واجب و پێویستە شکۆ و سنوورەکانی یەکتر بزانێت و نەیان بەزێنێت، چونکە ئوممەت لە تاکەکانی پێکهاتووە، ئەگەر تاکەکانی سنوور و شکۆی یەکتریان بەزاند ئیدی ئەم ئوممەتە شکۆ و ڕێز و هێز و سنووری نامێنێت، لەکۆتاییدا نابێ چاومان لە دوژمنانیش بێت کە ئەو شکۆ و سنوورانەمان بپارێزن و ئەوکات بەزاندنیان بۆ ئەمان

زۆر ئاسانتر دەبێت. ئەم بنەمایە لە کاتی ڕاجیایی و ئیختیلاف زیاتر و زۆرتر پێویستمان پێی دەبێت.

## (٢٠) عَدَمُ تَنْقِيصِ الْآخَرِينَ وَ تَأْثِيمِهِم

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە کەمنەکردنەوەی ئەوانی تر و تاوانبار نەکردنیان، چونکە کە ئێمە یەکترمان بە کەم زانی و شتی یەکترمان نادیدەگرت و یەکترمان تاوانبارکرد، ئیدی تاك بە تاکمان لەچاوی یەکتر کەم دەبینەوە و تاك بە تاکمان دەبینە تاوانبار لەچاوی یەکتردا.

## (٢١) عَدَمُ إلْزَامُ النَّاسِ بِشَخْصٍ أَوْ مَذْهَبٍ أَوْ رَأْيٍ أَوْ فِكْرٍ أَوْ حِزْبٍ أَوْ جَمَاعَةٍ (عَلَى الْإِطْلَاقِ)

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە پەیوەست نەکردنی خەڵکی بە کەسێك یان مەزهەب و ڕێباز و ڕاوبۆچونێك یان فیکر و حیزب و کۆمەڵ و پێڕ و تاقمێك بە ڕەهایی، چونکە پەیوەستبوونی ڕەهایی بە هەر کامێك لەمانە سنووری مرۆڤ تەواو تەواو سنووردار دەکات و ڕۆح و کەسایەتی و بیر و هۆش و عەقڵ و بیرکردنەوەی لەوانە دەرناچێت و ناتوانێت ببێت بە هی هەموو خەڵك و هەموو خەڵك

سوودی لێببینن، پەیوەست بوون بە فیکرێکی دیاریکراو ئاساییە بەمەرجێك بە ڕەهایی نەبێت و لێی نەبێت بە دین و دەمارگیری بۆی نەبێت.

## (٢٢) عَدَمُ اتِّخَاذِ الْإِسْلَامِ وَسِيلَةً لِلْمَصْلَحَةِ الدُّنْيَوِيَّةِ وَالشَّخْصِيَّةِ وَالْمَادِيَّةِ وَالْحَزْبِيَّةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بەکارنەهێنانی ئیسلام بۆ بەرژەوەندی دونیایی یان کەسێتی یاخود حیزبی یان کردنی بە هۆکاری ماڵ پەیداکردن، چونکە ئیسلام دەبێتە قوربانی مەبەستە ماددی و دونیاییەکانیان و ئومەتێکی بەرژەوەندی خواز و عەقیدە و بیر و باوەڕ و ئەخلاق لاواز دێتە کایەوە. زۆر جار ئیسلام دەکرێتە ئامرازی دەستی دوژمنانیش! دوژمنانیش بەکاری دێنن بۆ چاوبەستنی خەڵکی و فێڵ لێکردنیان! بۆیە دەبێ موسڵمانان ئاگاداری ئەمەش بن و بەکارهێنەرانی ئیسلام بۆ مەبەست و مەرامەکانیان بناسنەوە و پشتیوانی و پشتگیرییان نەکەن.

## (٢٣) عَدَمُ الاِشْتِغَالِ فِيمَا لَا يُدْرَكُ بِالْوَحْيِ وَالْعَقْلِ وَالْعِلْمِ وَالْحَوَاسِّ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بەدوادا نەچوون بۆ ئەو بابەتانەی کە نە لە ڕێی وەحی نە عەقڵ و نە زانست و نە هەستەکان پەیان پێ نابرێ. ئێمە زۆر شتمان هەیە بابەتی لێکۆڵینەوەی وەحی و عەقڵ و زانست و هەستن، کەواتە دەبێ بەوانەوە سەرقاڵ بین نەوەك بێین لە شتێ بکۆڵینەوە و کات لەشتێ بەهەدەر بدەین کە بە هیچ کام لەوانە پەیان پێنابرێت، زۆر جار کەسێك تەمەنێك لە شتێکی وا بەهەدەر دەدات! دەیان بەرگ کتێب دەنووسرێت لەسەری! لەکاتێکدا ئەو هەموو بابەت و پێویستییەی ترمان هەیە. زۆر بابەتی خیلافی هەیە بەهیچ یەکێك لە سەرچاوەکانی زانیاری یەکلا نابێتەوە، ئێ کەوایە خۆ سەرقاڵ کردن پێیانەوە لە پای چی؟!

## (٢٤) عَدَمُ إِثَارَةِ الْمَسَائِلِ الْعَقَدِيَّةِ وَالْفِكْرِيَّةِ وَالْفِقْهِيَّةِ الْمُخْتَلَفِ فِيهَا بَيْنَ عَوَامِّ النَّاسِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە نەوروژاندنی بابەتگەلێکی عەقیدەیی و بیر و باوەڕ و فیکری و فیقهی لەناو خەڵکی سادە و ڕەشۆکی - عەوام - کە زانایان تێیاندا کۆڕا نین و جیاوازن، چونکە بەم هۆیەوە چەند لێکەوتەیەکی خراپ دێنە کایەوە، لەوانە:

١. پەرتەوازەیی و دوژمنایەتی و ڕق و کینە.

٢. سەرقاڵکردنی خەڵکی عەوام بە شتانێك کە کاری ئەوان نییە.

٣. ناشیرینکردنی زانایان.

٤. سەر لە خەڵکی تێکدان و گومان پەیداکردن بۆیان.

## (٢٥) عَدَمُ الاِهْتِمَامِ بِالْجُزْئِيَّاتِ عَلَى حِسَابِ الْكُلِّيَاتِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گرینگی نەدان بە بابەتە - شتە - لاوەکییەکان لەسەر حسابی بابەتە گشتی و سەرەکییەکان، چونکە هەر کەس و ئوممەتێك بە شتی لاوەکییەوە سەرقاڵ بوو

بەدڵنیاییەوە شتە گەورە و گرینگەکانیان لەبیر دەچێتەوە، ئەوە بۆخۆی گەورەترین موئامەرەیە دژ بەم ئوممەتە دەکرێت، سەرقاڵ دەکرێن بە شتە لاوەکییەکان تاوەکو شتە گەورەکانیان لەبیر بچێتەوە، وا خەریکە ئوممەت بیر و فیکر و عەقیدە و بیر و باوەڕ و ئەخلاق و کۆمەڵگە و خێزان و تاکی لەناو دەچێت بەڵام ئێمە سەرقاڵ کراوین بە ...، سەرقاڵبوون بە شتە لاوەکی و جوزئییەکان لە سەردەمی شەڕی کوللیاتدا گەورەترین کارەساتە، ئێستا شەڕ شەڕی کوللیاتە نابێت ئوممەت سەرقاڵ بکرێت بە جوزئیاتەوە و مێشکی پڕ بکرێت بە شتی فەرعی و لاوەکی.

## (٢٦) عَدَمُ الْمُجَادَلَةِ وَالْبَحْثِ فِي مُفَاضَلَةِ الْعُلَمَاءِ بَعْضِهُمْ عَلَى بَعْضٍ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دمبەدمە و شەڕە قسە نەکردن لەسەر ئەو زانا و ئەم زانا و باوندان و بە بەرزتر دانەنانی هەندێکیان بە سەر هەندێکی تریاندا، چونکە ئەوکات ڕق و کینە و دووبەرەکی و شەخس پەرستی و ... بڵاو دەبێتەوە.

ئاساییە تۆ زانایێکت پێ لەزانایێك گەورەتر و باشتر و زاناتر و شارەزاتر بێت بەڵام ئاسایی نییە بێی شەڕی لەسەر بکەی و زانایانی بەرامبەری بشکێنی و ... .

## (٢٧) عَدَمُ الاِشْتِغَالِ وَالْخَوْضِ فِي الْمَسَائِلِ الَّتِي لَا يُبْنَى عَلَيْهَا عَمَلٌ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە سەرقاڵ نەبوون و ڕۆنەچوون و نەچوونە ناو کۆمەڵە بابەتێک کە کردەیی نین و کاریان لەسەر بنیات نانرێ و هیچ سوودێکیان نییە نە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی نە بۆ ژیان و نە بۆ ئیسلام، زۆر بابەتی ناکردەیی هەن کە ئوممەت پێیانەوە سەرقاڵکراوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەمیشە بڕوانرێتە بابەتەکان ئاخۆ چەندە کردەیی و سوودبەخشن، چونکە ئوممەت لەهەموو کاتێك زیاتر پێویستی بە کار و کردوە و بابەتە کردەییەکانە، ئینجا لەو بارودۆخە ناهەموارەی ئوممەتدا بێی ئوممەت سەرقاڵ بکەی بە شتانێك کە هیچیان لێ شین نابێت و هیچیان لێ بەرهەم نایەت ئەوە بە دڵنیاییەوە حاڵی ئوممەت لەوەی ئێستای باشتر نابێت.

## (٢٨) التَّعَاوُنُ فِي الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ وَالتَّسَامُحُ وَالِاحْتِرَامُ فِي الْمُخْتَلَفِ فِيهِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە هەبوونی گیانی هاوکاری و دەستبار بۆ یەکگرتن لەسەر ئەو کارانەی کە کۆک و هاوڕاین تێیاندا هاوکات لەگەڵ ئەوەدا چاوپۆشی کردن و ڕێزدانان بەرامبەر بە یەکتری لەو شتانەی کە تێیاندا جیاوازین و بۆچونی جیاواز هەڵدەگرن، چونکە کە وامانکرد چەند ئامانجێك بەدیدێن، لەوانە:

١. برایەتی و تەبایی و یەکگرتوویی و خۆشەویستی و سەرکەوتویی و ... .

٢. دوورخستنەوەی دوژمنایەتی و دووبەرەکی و ڕق و کینە و ... .

## (٢٩) الْجَمْعُ بَيْنَ الْقَدِيمِ وَالْجَدِيدِ وَعَدَمُ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي التَّمَسُّكِ بِهِمَا وَالِاهْتِمَامُ بِهِمَا

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە کۆکردنەوەی کۆن و تازە بەیەکەوە و زیادەڕەوي و کەم ڕەوی نەکردن لە دەست پێوە گرتن و گرینگی پێدانیان، کە ئەسڵ وایە ئێمە سوود لە پێش خۆمان و ئێستاش وەربگرین و هەردووکیان کۆبکەینەوە و دانەبڕێین

لە ئێستا و داهاتوو و شتە نوێیەکان، واتە لە ئێستا بژین بەسوود وەرگرتن لەوەی پێش خۆمان و ڕابردوو. واتە زانایانی کۆن و تازە، توراسی ڕابردوو و ئێستا، کتێب و بەرهەمی سەدەکانی ڕابردوو و سەردەمی تازە.

## (٣٠) تَجْرِيدُ الدَّعْوَةِ مِنَ التَّعَصُّبِ الْحِزْبِيِّ وَالشَّخْصِيِّ وَالطَّائِفِيِّ وَ ...

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بەدوور گرتن و داماڵین و - خاڵی کردنەوەی - بانگەواز و کاری ئیسلامی لە دیاردەی دەمارگیری مەزهەبی و پێڕگەرایی و تائیفی و بەکەسێتی کردنی کارەکان، چونکە ئایین کە دەمارگیری و تام و بۆی حیزبی و تایەفی و شەخسی پێوەکرا ئیدی دەبێتە شتێکی سنووردار و تەنها لەو چوارچێوەیەدا دەسوڕێتەوە و دەبێتە هۆی دووبەرەکی و دوژمنایەتی و ڕق و کینە کە دیارە ئەمانە دوورن لە فەلسەفەی پەیامی خوایی.

## (٣١) عَدَمُ تَصْحِيحِ الآخَرِينَ أَوْ نِصْحِهِمْ فِي الْعَلَنِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ئامۆگاری نەکردن و ڕاست نەکردنەوەی کەسی بەهەڵەداچوو و تاوانبار بە بەرچاوی خەڵکەوە و بە ئاشکرا و ڕەچاوکردنی مەرجە شەرعییەکان تێیدا، چونکە ئامۆژگاری و نەسیحەت ڕێکار و مەرج و ڕێوشوێنی خۆی هەیە، ئەگەر ئەمانەی تێدا ڕەچاو نەکرا ئیدی دەبێت بە هەست بریندارکردن و دڵ شکاندن و ڕەجاندن و ... .

## (٣٢) عَدَمُ الْمُنَاقَشَاتِ وَالْحِوَارَاتِ فِي الْعَلَنِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گفتوگۆ نەکردن لەبەر چاوی خەڵك و بە ئاشکرا، چونکە هەموومان دەزانین گفتوگۆکردن لەبەر چاوی خەڵک و بە ئاشکرا و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن و ڕاگەیاندنەکان وا لە کەسی بەرامبەر ناکات مل بدات بۆ ڕاستی و حەق وە دەبێتە هۆی ڕق و قینە و ...، دەکرێت بۆ هەندێ بابەت بە ئاشکرا و بە بەرچاوی خەڵکەوە گفتوگۆ بکرێت، بەڵام نەك هەموو بابەتێك، زۆر بابەت کە دەوروژێنرێت تایبەتە بە زانایان خۆیانەوە نەوەك بۆ خەڵکی عەوام، چونکە ئەمە زۆر جار دەبێتە

هۆی هەڵە تێگەیشتنی خەڵکی عەوام لە خودی بابەتەکان و هەم لەو کەسانەی ئەم جۆرە گفتوگۆیانەش دەکەن.

## (٣٣) اتِّخَاذُ الحِوَارِ وَسِيلَةً لِلْوُصُولِ إِلَى الْحَقِّ وَالْحَقِيقَةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بەکارهێنانی گفتوگۆ وەک هۆکار و ڕێگاییێک بۆ گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت، چونکە گفتوگۆکردن بە مەرج و ڕێ و شوێنی خۆی هۆکارێکی زۆر باشە بۆ ئەم مەبەستە نەک لەیەک خوێندن و دوژمنایەتی و تۆمەتبارکردنی یەکتری لە دوورەوە و بە پاشە ملە، کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ دەبێتە هۆی کرانەوەی ئوممەت و دانەخرانی بەسەر ئوممەت و شارستانییەکانی تریش و لێك تێگەیشتن و هەماهەنگیش دێتە کایەوە، وە بەم هۆیەشەوە عەقڵ و فیکرەکان زیاتر گەشە دەکەن و زیاتر فراوان دەبن.

گرتنەبەری ڕێگەی دیالۆگ و گفتوگۆ بۆ بابەتە ڕاجیایی لە سەرەکان و گەیشتن بە ئەنجامی بەرهەمدار.

## (٣٤) عَدَمُ رَفْضِ إِمْكَانِ تَعَدُّدِ الصَّوَابِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە باوەڕبوون بە چەندایەتی دەرئەنجامی جۆراوجۆر و دروست و پێکانی چەند لایەنە و زیاد لە ڕوییێک و ڕەت نەکرنەوە و وەلانەنانی، چونکە زۆر ئاسایی و واقیعییە لە یەک کاتدا چەند شتێکی ڕاست هەبێت وە ئەو تێگەیشتنە زۆر هەڵەیە کە پێی وایە لەهەموو شتێکدا دەبێ یەک ڕاستی و حەقیقەت هەبێ ئەویش ئەوەیە کە لای ئەوە، ئەوە باسی شتە کۆدەنگی لەسەر و قەتعییەکان نییە، بەڵکو باسی بەشەکەی ترە کە بەشە هەرە زۆر و گەورەکەیە، چونکە زۆرێك لە خەڵکی هەموو شتێکی لەلا قەتعییە و پێی وایە لادان لەم قەتعییە لادانە لە حەق!

## (٣٥) عَدَمُ الِادِّعَاءِ بِأَنَّ الْمُخَالِفَ مُخْطِئٌ دَوْمًا (صَرَاحَةً أَوْ دَلَالَةً)

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بانگەشەنەکردن و بڵاونەکردنەوەی دەنگۆی ئەوەی کە کەسی بەرامبەر - ئەوانەی کە خاوەنی ڕای جیاوازن - هەمیشە لە هەڵەدان و بە هەڵەدا چوون و لایانداوە، ئەم جۆرە بانگەشەیە جاری وا هەیە بە ڕاشکاوی

دەکرێت و جاری واش هەیە بە ناڕاشکاوی، ئیمامی شافعی لەم بارەیەوە قسەیەکی زۆر جوانی هەیە کە دەکرێت بکرێتە بنەما بۆ ئەم بابەتە، دەفەرمویێت: (رَأْيِي صَوَابٌ يَحْتَمِلُ الخَطَأَ وَرَأْيُ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصَّوَابَ) واتە: ڕای من ڕاستە بەڵام ڕەنگە هەڵەش بێت، ڕای بەرامبەرەکەم هەڵەیە بەڵام ڕەنگە ڕاست بێت. کەواتە زۆر ئاساییە ڕای خۆت پێ ڕاست بێت و باوەڕ و قەناعەتی تەواویشت پێی هەبێت بەڵام ئاسایی نییە ڕای هەموو خەڵکت بە بەردەوامی پێ هەڵە بێت و پێشت وابێت هەرگیز ڕاستی ناڵێن و ڕاستییان لا نییە و هەموو ڕاستییەکان لای تۆن.

## (٣٦) التَّمْيِيزُ بِيْنَ الْخَطَأِ وَالْخَطِيئَةِ وَبَيْنَ الْقُصُورِ وَالتَّقْصِيرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە جیاوازی کردن و لێککردنەوەی نێوان هەڵەیەک کە بە نەزانی دەکرێ لەگەڵ هەڵەیەک کە بە زانین و ئاگاییەوە دەکرێت، یان لە نێوان نەبوونی توانا و دەستەوەستانی لەگەڵ کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانی، چونکە ئەگەر ئەم یاسایە جێبەجێ بکرێت ئوممەت هەرگیز لێك هەڵناوەشێت و برایەتی و خۆشەویستی و لەگەڵ یەکبوون و ... بڵاو دەبێتەوە و هەمووان دەتوانن بەیەکەوە بژیێن و کار بکەن،

بەڵام ئەگەر وا نەبوو ئەوە بەدڵنیاییەوە ئوممەت لێك هەڵدەوەشێت و هەرگیز ناتوانێت هەستێتەوە، چونکە بەدگومانی کاریگەری زۆر خراپ جێدێڵێت.

## (٣٧) الابْتِعَادُ عَنِ التَّعْمِيمِ الْفَاسِدِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دوورکەوتنەوە و خۆبەدوورگرتن لە گشتاندن و حوکمدان بە ڕەهایی، واتە بە گشتی حوکم نەدان و قسەنەکردن و جیاکردنەوەی کەس و بابەتەکان لە یەکتری، بۆ نموونە نەڵێی: هەرچی ئەوەیە (.....) خراپە و ...، چونکە تەعمیم و گشتاندن حەق ون دەکات و لەگەڵ یەك بوون و یارمەتی دان و ... ناهێڵێت و لەناوی دەبات.

## (٣٨) التَّثَبُّتُ فِي النَّقْلِ وَالرِّوَايَةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە لێکۆڵینەوە و پشتڕاست کردنەوەی ئەو شتانەی دەگوازرێنەوە و دەگەیێنرێن و بڵاودەکرێنەوە، زوو باوەڕنەکردن و خۆشباوەڕی، وە بڵاونەکردنەوەیان پێش لێکۆڵینەوە و دڵنیابوون، ئەم یاسایە پەیوەندی بەهەموو جۆرەکانی وتە و قسە و ڕاگەیاندن و نووسراو و بینراوەوە هەیە، پەیوەندی بە

خودی کتێبەکانیشەوە هەیە، چونکە پڕیانە لە گێڕانەوەی ناڕاست، بەتایبەت دەربارەی ئیسلام و مێژووەکەی، بۆیە لەمڕۆدا لە هەموو کاتێکدا زیاتر پێویستمان بە جێبەجێکردنی ئەم یاسایە هەیە لە هەموو نووسرا و وترا و ڕاگەیەنراوەکان.

## (٣٩) عَدَمُ حَمْلِ كَلَامِ الْمُخَالِفِ عَلَى أَسْوَئِهِ وَأَقْبَحِهِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە لێکنەدانەوە و شرۆڤەنەکردنی قسەی ئەوانەی هاوڕانین لەگەڵت بە ناشیرینترین و بێزراوترین شێواز، ئەسڵ وایە هەتا دەکرێت قسە و ڕاوبۆچوونەکان بەجوانی و بە نییەت پاکییەوە لێکبدرێنەوە و بە هیچ جۆرێك بە لاڕێدا نەبرێن، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەوە بە دڵنیاییەوە دەبێتە هۆی ڕق و کینە و دووبەرەکی و سوود نەبینین لەیەکتری.

## (٤٠) التَّجَاهُلُ وَالتَّغَافُلُ فِي بَعْضِ الْأُمُوْرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بە هەند وەرنەگرتن و گوێ نەدانە هەندێک کار و گوفتار کە دەشێ چاوپۆشیان لێ بکرێت و گوێیان پێ نەدرێت، وە خۆ کەڕکردن لەپێناو مانەوەی

خۆشەویستی و داپۆشینی هەڵە و کەم و کوڕی، زۆر شت هەیە کە هی ئەوەیە چاوپۆشی لێبکرێت و نادیدە بگیرێت، ئەوەش تەنها لە پێناو مانەوەی خۆشەویستی و دوورخستنەوەی دووبەرەکی و دڵ لەیەك گەردگرتندا، چونکە کە مرۆڤ هەموو شتێکی لە دڵ گرت و ئامادە نەبوو چاوپۆشی بکات ئەوە بە دڵنیاییەوە هەم سەرقاڵ دەبێت بە شتی لاوەکییەوە هەمیش لەبەریەك هەڵدەوەشێت.



## (٤١) الرِّفْـــقُ



یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لەنەرم و نیانی و بەکارنەهێنانی توندوتیژی و دڵڕەقی و قسە ڕەقی، چونکە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرِمِ الخيرَ كُلَّهُ) رواه مسلم، واتە: هەرکەسێك بێ بەش بێت لە نەرم و نیانیی ئەوە بێبەش دەبێت لە هەموو خێر و چاکەیەك.

وە دەفەرموێت: (إنَّ الرِّفْقَ لا يَكونُ في شيءٍ إلَّا زانَهُ، ولا يُنْزَعُ مِن شيءٍ إلَّا شانَهُ) مسلم ٢٥٩٤، واتە: نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا بێت ئیللا جوانی دەکات، وە لە هەرشتێك دابڕنرێ ئیللا ئەوشتە ناشیرین دەکات.

## (٤٢) الرُّجُوعُ إِلَى الْحَقِّ (بَعْدَ ظُهُورِهِ)

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی با بە زیانی خوشی بشکێتەوە، چونکە هەر ئوممەتێك حەق لای سەنتەر بوو سەردەکەوێت، بە پێچەوانەشەوە تێك دەشکێت، بەتایبەت ئوممەتی ئیسلام لە هەموو ئوممەتێك لە پێشترە تاوەکو شوێنی حەق بکەوێت و لێی لانەدات، چونکە خاوەنی پەیامی خوایی دەستکاری نەکراوی حەقە، گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی پاشەکشە و تەنازول و عەیب نییە وەك ئەوەی کە وێناکراوە لامان، بەڵکو گەورەیی و سەربەرزی و سەرکەوتنە لە دونیا و قیامەتدا، ئیمامی شافیعی و گەورە زانایانی دیکە لە دەیان و سەدان بۆچوون پەشیمان بوونەو و پێشیان عەیب نەبووە، هەربۆیە ئیمامی شافیعی قەولی قەدیم و جەدید هەیە، مانا شوا نییە ئەوەی ڕابردوو تەواو تەواو هەڵە بووبێت، بەڵکو دەکرێت ئەمەیان بۆ ئەم سەردەم و شوێن و کات و بارودۆخە ببێت، ئەوەی تریشیان بۆ سەرەدم و کات و شوێن و بارودۆخێکی دیکە.

## (٤٣) عَدَمُ تَجَاهَلِ إِحْسَانِ الآخَرِينَ وَذِكْرُهُ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە خۆنەزان نەکردن لە ئاست چاکەی کەسانی بەرامبەر و باس کردنیان، چونکە پێزانین و هاندان و لەبەرچاوگرتنی کارەکانی یەکتری بەهێزترین ئامرازە بۆ و بەردەوامی لەسەر کارەکان و خۆشەویستی و دەستباری یەکگرتن و ...، بەڵام ئەگەر چاکەی چاکان لەبەر چاو نەگری و پێزانینت نەبێت ئەوە هەم خۆت لەکەدار دەکەی هەمیش نابیتە پاڵنەری خێر و چاکە و چاکسازی و لە پاداشتیشیاندا بەژدار نابی.

## (٤٤) عَدَمُ تَقْدِيمِ الْمَصَالِحِ الْخَاصَّةِ عَلَى الْعَامَّةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە پێشخنەخستن و باونەدانی بەرژەوەندی تایبەت و کەسی بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا، چونکە ئیسلام هەمیشە دەیەوێت هاوسەنگی لە نێوان تاك و گۆمەڵگەدا ڕابگرێت، بەڵام ئەگەر تێککیران ئەوە بە دڵنیاییەوە ماف و حەقی گشتی و گۆمەڵگە و کۆمەڵ پێش دەخات و هەرگیز ڕێگە نادات بەرژەوەندییە کەسییەکان زاڵ ببن بەسەر بەرژەوندییە گشتییەکاندا،

بۆیە ئیسلام هەمیشە دەیەوێت ئوممەتێکی خۆنەویست و خوا ویست بێتە کایەوە، نەوەك ئوممەتێکی خۆپەرست و ئەنانی. هەربۆیە ناکرێ ئوممەت و میللەت بکرێنە قوربانی خیلافاتی شەخسی و مەزهەبی و ...

## (٤٥) عَدَمُ التَّنَافُسِ غَيْرِ الْمَشْرُوعِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە کێبڕکێ نەکردنی ناشەرعیانە و ناشەریفانە و کارنەکردن لەسەر حیسابی ئەوانی تر، پێشبڕکێ بۆ کاری چاك فەرمان پێکراوە، بەڵام پێشبڕکێ بۆ شکاندنی یەکتر و لەسەر حیسابی یەکتر نەهی لێکراو و خراپە، چونکە ئەوە نابێتە پێشبڕکێ ئەوە دەبێتە ملشکاندنی یەکتری و ڕق و کینە و دووبەرەکی و دوژمنایەتی و ... .

## (٤٦) عَدَمُ إِظْهَارِ النَّفْسِ مِنْ قِبَلِ (الْعُلَمَاءِ وَالدُّعَاةِ وَالطُّلَّابِ) عَلَى حِسَابِ الدَّعْوَةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە خۆ دەرنەخستن و خۆ سەرنەخستن لەسەر حیسابی بانگەواز لەلایەن زانایان و بانگخوازان و فێرخوازان و خوێندکارانی زانستی شەرعی، چونکە

ئەمە لەکۆتاییدا پەیامە خواییەکە لەناو دەبات و ناشیرینی دەکات و خەڵك لە پەیامی خودا دوور دەخاتەوە و خۆشەویستی و برایەتی ناهێڵێت و هەلپەرستی و خۆپەرستی و ئەنانیەت دێنێتە کایەوە و جوانی کەسەکان ناهێڵێت، بۆیە دڵسۆزی و خۆدەرنەخستن و فیزلێنەدان بە زانست و بانگەوازەوە لەلایەن زانایان و بانگخوازان و قوتابیانەوە جوان و خۆشەویستیان دەکات، لەپاشانیشدا ئەمە ڕەنگدەداتەوە لەسەر ئوممەت و پێشی دەخات.

## (٤٧) عَدَمُ الْجُمُودِ الْفِقْهِيِّ وَالْفِكْرِيِّ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕانەوەستاوی و سستی نەکردن لە بەرەو پێشچوونی فیقهی و فیکریدا، چونکە ڕاوەستاوی لە بواری فیقهی و فیکریدا ڕاستەخۆ ڕەنگدانەوەی زۆر خراپی دەبێت لەسەر هەموو کایەکانی ئوممەت و ئوممەتێکی ڕاوەستاو و پێشنەکەوتوو دێتە بەرهەم، ژیان لەناو مێژوودا و گەڕانەوە بۆ دواوە و پێش خۆت و بیرکردنەوە بە بیرکردنەوەی ئەوان لەهەموو شتێکدا غەیری عەقڵ گرێدان شتێکی تر نییە.

## (٤٨) التَّوَازُنُ بِينَ الرُّوحِ وَالْعَقْلِ وَالْجَسَدِ وَالْمَادَّةِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕاگرتنی هاوسەنگی لەنێوان ڕۆح و عەقڵ و جەستە و ماددەدا، چونکە ئەمانە هەموویان پەیوەندییێکی ڕاستەوخۆیان بەیەکەوە هەیە و ڕانەگرتنی هاوسەنگی لە نێوانیاندا گەورەترین گێژاو و شپرزەیی و ... دروستدەکات و لە ئەنجامدا هیچیان بە ساغ و سەلامەت نامێننەوە و وردە وردە ئەم مرۆڤە لە یەکێکیاندا دەتوێتەوە و ئەوانی تر فەرامۆش دەکات، یان تێکیان دەدات و دووریان دەخاتەوە لە هاوسەنگی.

## (٤٩) الْاِهْتِمَامُ بِالْأَدِلَّةِ الْعَقْلِيَّةِ فِي إِثْبَاتِ الدِّينِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گرینگیدان بە بەڵگەی عەقڵی لە جێگیرکردنی ئاییندا، بۆ نموونە کە باسی خودا و وەحی و پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەرایەتی و ...، هەموو بابەتەکانی عەقیدە و فیکر و شەریعەت و ئەخلاق دەکەیت هەرگیز بەڵگەی عەقڵیت بیر نەچێت، چونکە هەم جوانتر و باشتر و کاریگەرتر جێگیر دەبێت، هەمیش دوودڵی و گومانی نامێنێت و ئەوەیشی لە داهاتوودا

بۆی دروست دەبێت دەڕەوێتەوە و نامێنێت، ئارامی و ئاسایشێکی فیکری و دەروونی بۆ دروست دەبێت و هەرگیز ناکەوێتە شەڕ و جەنگ لە گەڵیاندا.

## (٥٠) التَّفْكِيرُ النَّاقِدُ وَالتَّوْثِيقُ الْعِلْمِيُّ فِي التَّعَامُلِ مَعَ الْأَفْكَارِ وَالمَعْلُومَاتِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و توندوتۆڵکردنی زانستی لە مامەڵەکردن لەگەڵ زانیاری و بیر و باوەڕەکاندا، بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و بەدواداچوونی زانستی ئوممەتێکی زیندوو و ڕەخنەگر دروست دەکات، نەوەك وەك ئەوەی ئێستا دەیبینین کە زانیارییێك یان بیر و باوەڕ و فیکرێك دەخرێتە ڕوو ڕاستەوخۆ خەڵکێکی زۆر پێی سەرسام دەبێت و وەریدەگرێت و بڵاوی دەکاتەوە و شانازی پێوە دەکات! کەواتە پێویستە هەر کاتێك بیر و باوەڕ یان فیکرێك دەخرێتە ڕوو بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە لێی بڕوانینن و بەدواداچوونی زانستی بۆ بکەین و ڕاستەوخۆ خۆمانی تەسلیم نەکەین، ئەگەرنا ئوممەتێکی بەزیو و تەسلیم بوو دێتە کایەوە.

## (٥١) الرُّجُوعُ إِلَى الْقُرْآنِ بِفَهْمٍ صَحِيحٍ ، وَعَقْلٍ سَلِيمٍ، وَجِسْمٍ نَشِيطٍ وَجَادٍّ وَقَائِمٍ ، وَقَلْبٍ وَرَوْحٍ مُسْتَقِيمٍ وَمُسْتَقِلٍّ وُمسْتَقَرٍّ وَمُطْمَئِنٍّ وَحَاضِرٍ وَيَقْظٍ وَقَابِلٍ لِلْحَقِّ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە گەڕانەوە بۆ قورئان بە تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست بە عەقڵێکی تەواو و تۆکمە و دامەزراو و جەستەیەکی چالاک و لەسەر پێ وەستاو و دڵ و ڕۆحێکی جێگیر و سەربەخۆ و دامەزراو و تێگەیشتوو وئاگادار و حەق و ڕاستی قەبوڵکەر، گەڕانەوە بۆ قورئان بەم شێوازە ئوممەت ڕاستەڕێ و سەربەرز و سەرکەوتوو دەکات، بەڵام بەتەنها خوێندنەوە و لەبەرکردنی بێ تێگەیشتن و کارپێکردنی هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت و حاڵمان لەوەی ئێستا باشتر نابێت.

## (٥٢) عَدَمُ الْاِعْتِقَادِ بِأَنَّ الدَّعْوَةَ لِلْاِتِّفَاقِ إِلْغَاءٌ لِلْاِخْتِلَافِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە باوەڕنەبوون بەوەی کە بانگەوازی کردن بۆ یەکدەنگی و تەبایی و لەگەڵ یەکبوون واتە نەهێشتنی جیاوازی، کە وا نییە، چونکە زۆر ئاساییە لەگەڵ یەک بین و جیاوازیشمان هەبێ، وەک زانایانی پێشینمان، وەك باسمان کرد ئێمە دەبێ لە شتە هاوڕاکان یارمەتی یەکتری بدەین، وە لەشتە ڕاجیاییەکانیشدا ڕێز لە یەکتری بگرین و گومانی باش بە یەکتری بەرین و عوزر بۆ یەکتری بێنینەوە.

## (٥٣) عَدَمُ إِثَارَةِ الْخِلَافِ الْمَوْجُودِ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ وَالدُّعَاةِ وَالْجَمَاعَاتِ عِنْدَ عَوَامِّ النَّاسِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە نەوروژاندنی جیاوازی نێوان زانایان و بانگخوازان و گروپەکان و کۆمەڵەکان لە لای خەڵکی عەوام، چونکە ئەوان ناتوانن بە باشی لەو شتانە تێبگەن بەم کارە هەم سەر لەوان دەشێوێنن هەمیش ئەوانە لای خەڵك ناشیرین دەکەن، زۆرێك لە بابەتەکان هی ئەوە نین لەناو خەڵکی بوروژێنرێن، چونکە غەیری زەرەر و زیان و سەر ئێشە هیچی تر نییە.

## (٥٤) التَّرْكِيزُ عَلَى الْجَوَاهِرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە لە تیشك خستنە سەر ناوەڕۆك و جەوهەر نەوەك زاهیری شتەکان، چونکە ئەگەر تیشك بخەینە سەر ناوەڕۆك و جەوهەری شتەکان هەرگیز تووشی هەڵە و پەشیمانی نابین، بەڵام ئەگەر وانەبو و تیشکمان خستە سەر ڕووکەشی شتەکان ئەوە بە دڵنیاییەوە حەقیقەت نابینین و ڕاستیمان لێ ون دەبێت و تووشی هەڵەی زۆر گەورە و کوشندە دەبین و زاهیری و کورتبینی ڕوومان تێدەکات.

## (٥٥) الْحَذَرُ مِنَ الْإِكْثَارِ فِي الرُّدُودِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ئاگاداربوون و دووربوون لە ڕەتدانەوە و وەڵامدانەوەی زۆر و لەڕادەبەدەر، زۆر جار زێدەڕۆیی دەکرێت لە ڕەدد و ڕەدکاریی و وەڵامدانەوە، بابەتی وا بچووك هەیە دەیان ڕەددی دراوەتە و خەڵکێکی زۆی پێوە سەرقاڵکراوە! بۆیە وەڵامدانەوەی زۆری موخالیفەکانمان - لەناو موسڵمانان‌دا - کارێکی هەتا بڵێی نابووت و خراپە و غەیری سەرقاڵکردنی موسڵمانان بە شتی بچووك و لاوەکییەوە هیچ شتێکی تر نییە.

## (٥٦) عَدَمُ النَّقْدِ الغَيْرِ الْمُنْصِفِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕەخنەنەگرتنی نابەجێ و بێ ئینسافانە، یەکێك لە شتە جوانە شارستانییەکان بریتییە لە ڕەخنە، ڕەخنە لە ڕا و بۆچوون و کتێب و تیۆریا و مەزهەب و زانا و ...، بەڵام کاتێك جوان و باش دەبێت کە ئینسافی تێدابوو، کە ئینسافی تێدا نەبوو غەیری حەسوودی و دووژمنایەتی و ڕق و کینە شتێکی تر بەرهەم ناهێنێت، وە دەبێ ڕەخنەکان ئاڕاستەی خودی بیر و ڕا و بۆچوون و تێز و تیۆرکان بکرێن نەوەك دەستبردن بۆ شتی کەسی و شەخسی.

## (٥٧) الْعَدْلُ حَتَّى مَعَ الْأَعْدَاءِ وَالْمُخَالِفِينَ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە دادگەری هەتا لەگەڵ دوژمنان و موخالفەکانیش، دادگەری بناغە و کۆڵەکەی کۆمەڵگە و ئایین و شارستانییەتە، بۆیە دەبێ لە هەموو کایە جیاوازەکانی ژیاندا ڕەچاو بکرێت و جێبەجێ بکرێت، لەناویشیاندا مامەڵەی دادگەرانە لەگەڵ موخالیفەکان هەتا لەگەڵ دوژمنانیشدا، کە نابێ دادگەری دابڕنرێت لە پەیوەندیی و ... لەگەڵیاندا.

## (٥٨) مُرَاعَاةُ النَّتَائِجِ فِي الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ وَالْمَوَاقِفِ وَالْفَتَاوَى وَالاِجْتِهَادَاتِ ( مُرَاعَاةُ فِقْهِ الْمَآلَاتِ )

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ڕەچاوکردنی سەرەنجامی گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێست و فەتوا و ئیجتیهادەکان، زۆجار قسە دەکرێت و هەڵوێست دەنوێنرێت و فەتوا دەدرێت بەڵام بیر لەسەرەنجامەکەی ناکرێتەوە، بیر لە لێکەوتە خراپەکانی ناکرێتەوە، هەربۆیە زۆر جار بە هۆی قسەیەك یان هەڵوێست و بڕیارِ و فەتواییێك خەڵکێکی زۆر یان گەل و ئوممەتێك زەرەرمەند دەبن و تووشی ناڕەحەتی و زەحمەت و ناهەمەتی دەبن، بۆیە پێویستە پێش دەرکردنیان ڕەچاوی هەموو لێکەوتەکان بکرێت ئینجا دەستی بۆ ببرێت.

## (٥٩) الْاِعْتِقادُ بِأَنَّ الْمَعْصِيَةَ وَالْخَطِيئَةَ وَالْكَبِيرَةَ لَا تُخْرِجُ صَاحِبَهَا مِنَ الدِّينِ وَلَا يَقْطَعُ الْمُوَالَاةَ مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهَا

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە باوەڕبوون بەوەی کە گوناهو تاوان و هەڵە و گوناهی گەورە خاوەنەکەی لە ئایین دەرناکات و دۆستایەتیش ناپچڕێنێت مادام بە حەڵاڵی نەزانێت، گوناهو تاوان نەهی لێکراو و دژایەتی کراون لە ئیسلامدا، بەڵام خاوەنەکەی کە ئەنجامیدا پێیان لە ئیسلام دەرناچێت، هەروەك خەواریجەکان دەیان گوت، لای ئەمان ئەگەر کەسێك گوناهێکی گەورە بکات ڕاستەوخۆ پێی لە ئایین دەرچێت و لای ئەمان کافر و لە ئایین دەرچووە!!!

## (٦٠) الْاِنْتِفاعُ مِنَ الْمُخَالِفِ وَالْأَعْدَاءِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە سوود بینین لە موخالیف و دوژمنان، سوود بینین لە کەسی موخالیف و دوژمنیش یەکێکە لە بنەماکان کە دەبێ بڕوامان پێی هەبێت و کاری پێ بکەین، حەق و ڕاستی و جوانی و باشی و زانست و زانیاری و پێشکەوتن و ... لە

هەر کەسێکەوە بێت دەبێ دەرگامان واڵا بێت بۆی و وەریبگرین و سوودی لێببینین، چونکە حەق و جوانی و باشی و ...، هەرگیز هەمووی لای کەسێك و گروپێك و حیزبێك کۆنابێتەوە.

## (٦١) قَصْدُ هِدَايَةِ الْمُخَالِفِ عِنْدَ الْاِخْتِلاَفِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لەوەی کە لەکاتی جیاوازی و ڕاجیاییدا لەگەڵ جیاواز و موخالیفەکاندا مەبەستت هیدایەتدانیان بێت نەوەك شتی تر، ڕاجیایی و جیاوازی زۆر ئاساییە و زۆرکات ڕەحمەتە، بۆیە دەبێ کە جیاواز بووین لەگەڵ جیاوازەکانماندا مەبەستمان ئەوە بێت ئەوانیش هیدایەت وەربگرن و ...، بەڵام ئەوە نابێ ببێتە هۆی ئەوەی تۆ وا ببینی بەس تۆ لەسەر حەقی و ئەو خەڵکەی تر هەمووی گومڕا و سەرلێشێواوە! حەقی خۆتە خۆت پێ لەسەر حەق بێت، بەڵام حەقی خۆت نییە پێت وابێت خەڵکی تر هەمووی لەسەر گومڕایین و بەدوای کڵاوی بابردوو کەوتوون!

## (٦٢) عَدَمُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الْمُخَالِفِينَ، وَهُمْ فِي مَنَازِلٍ مُتَفَاوِتَةٍ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە یەکسانی نەکردن لەنێوان موخالیفەکاندا، چونکە ئەمانیش جۆر و پلە و ئاستی جۆراوجۆریان هەیە، چونکە هەمانە زۆر لە حەقەوە نزیکە، هەشمانە مام ناوەندە، هەشمانە زیاتر دوورکەوتۆتەوە، هەمانە لەگەڵ ئەوەی موخالیفمانە بەڵام مەجالی کار لەگەڵ کردنیدا هێشتۆتەوە، وە هەروەها هەمانە لەگەڵ ئەوەی موخالیفە بەڵام تەنها خۆی لەسەر حەق نابینێت، وە هەشمانە موخالیفێکە کە دەگەڕێ بەدوای حەقدا و بەدوایدا عەودالە، وە ... .

## (٦٣) الصَّبْرُ عَلَى أَذَى الْمُخَالِفِينَ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ئارامگرتن لەسەر ئەزیەت و ناڕەحەتییەکانی موخالیفەکان، چونکە بە دڵنیاییەوە قبوڵکردنی جیاوازی و ڕاجیایی ئەزیەت و ئازار و ناڕەحەتی خۆی هەیە لە زۆر کات و شوێن و بارودۆخدا، ئەگەر ئەمانە قبوڵ نەکرێن ئەوە بە دڵنیاییەوە جیاوازی و ڕاجیاییەکان دەبن بە دوژمنایەتی و دووبەرەکی و ڕق و کینە، بۆیە دەبێ نەفس ڕابهێنرێت لەسەر

ئارامگرتن لەسەر ئەو ناڕەحەتی و ئازارانە و بە شتێکی ئاسایی ببینرێن.

## (٦٤) الْمُحَافَظَةُ عَلَى السَّكِينَةِ الْاِجْتِمَاعِيَّةِ وَأَمْنِهَا عِنْدَ الْاِخْتِلاَفِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە پارێزگاری کردن لە ئارامی و ئاشتی کۆمەڵایەتی لە کاتی جیاوازییەکاندا، چونکە ئەگەر زۆر ئاگادار نەبین بە هۆی جیاوازییە فیکری و سیاسی و فیقهی و عەقیدەییەکانەوە کۆمەڵگە لێك هەڵدەوەشێت و جۆرەها شەڕ و جەنگ و ... ڕوو دەدەن و ئارامی و ئاشتی کۆمەڵایەتی تێك دەچێت، وەك زۆر جار لە سەردەمی صەحابە و غەیری صەحابەوە بینومانە هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت کە بە دەیان و سەدان و هەزار کەس کوژراون و ...، یان زۆر جار دەبێتە هۆی ئەوەی ژن و مێرد و منداڵ و باوك و دایك و خزم و ... لێك تورە بن و لێك بترازێن و شیرازەی خێزان و کۆمەڵگە تێك بچێت و ئاشتی و ئاسایش و ئارامی کۆمەڵگە و وڵات بکەوێتە مەترسییەوە.

## (٦٥) نُصْرَةُ الْمُخَالِفِينَ عِنْدَ الْبَغْيِّ عَلَيْهِمْ وَالظُّلْمِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە سەرخستنی موخالیفەکان لەکاتی دەستدرێژی کردنە سەریان و ستەم لێکردنیان، چونکە ئەم سەردەمە سەردەمی زوڵم و ستەم و دەستدرێژی کردن و ناوزڕاندن و لەکەدارکردن و ... ە، بۆیە ئەگەر ئەم یاسایە جێبەجێ نەکرێت هەموو تاك و کۆمەڵە و ئاڕاستەکان دەکەونە ژێر مەترسییەوە بە تەنها و بەبێ پاڵپشتی برا و خوشکەکانیان ناتوانن ئەم بەرگرییە بەهێزە بکەن و لە ئەنجامدا چین چین و بەش بەش لەناو دەبرێین و ڕەش دەکرێینەوە.

## (٦٦) عَدَمُ تَسْمِيَةِ الْمُخَالِفِينَ بِمَا لَا يُحِبُّونَهُ وَلَا يَرْضُونَ بِهِ وَلَا يَنْطَبِقُ عَلَيْهِمْ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە ناونەنانی موخالیفەکان بە ناوێك کە پێیان خۆش نییە و پێی ڕازی نین یان هەر لەسەریان جێبەجێ نابێت، چونکە ئەمەش دووبارە دەبێتە هۆی لێك ترازان و ڕق و دووبەرەکی و ...، ناونان بە ناوێك کە پێی ناخۆشە و پێی

ڕازی نییە هەم بۆ ئەوان ناخۆشە هەمیش دەبێتە خۆ جیاکردنەوەی تەڕەفی بەرامبەر و بەربەستێکی دەستکرد دێتە کایەوە لەنێوانیاندا.

## (٦٧) الْوَسَطِيَّةُ وَعَدَمُ الْعُنْفِ وَالتَّطَرُّفِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە میانڕەوی و ناوەندگیری و دووربوون لە توندوتیژی و پەڕگیری (تەڕەفگیری)، تطرف هەر توندڕەوی ناگرێتەوە بەڵکو شلڕەویش دەگرێتەوە، چونکە تطرف واتە پەڕگیری (تەڕەفگیری)، واتە تەڕەفێك بگری، جا تەڕەفی توندی بێت یان تەڕەفی شلی هەر تطرفە، بۆیە وەسەتیەت و میانڕەوی و ناوەندگیری ئوممەت لە هەڵدێران دەپارێزیت، چونکە ئەوەی تەڕەف بگرێت جا شلی بێت یان توندی ئەوە لەسەر ڕۆخەکەیە و هەڵدێران و کەوتنی زۆر نزیکە.

## (٦٨) الْتَّوَاْزُنُ بَيْنَ ثَوَابِتِ الشَّرْعِ وَمُتَغَيِّرَاتِ الْعَصْرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان نەگۆڕەکانی شەریعەت و گۆڕاوەکانی سەردەم، چونکە شەریعەت نەگۆڕی هەیە و سەردەمیش گۆڕاو، ئەگەر بە هەستیاری و بە

وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە زۆر خەڵك توشی تێك گیران دەبن لەگەڵ ئاییندا و ناتوانن هاوسەنگی ڕابگرن، بۆ ئەوەی سنووری نەگۆڕەکان نەبەزێنین و نەگۆڕەکانمان لەدەست نەچن و نەکەونە بەر مەترسی بەزاندن و شێواندن، وە هەم بۆ ئەوەی لە گۆڕاوەکانی سەردەمیش بەجێ نەمێنین و لەگەڵیاندا بڕۆین پێویستە هاوسەنگییەکی تەواو ڕابگرین و زۆر ئاگادار بین.

## (٦٩) التَّوَازُنُ بَيْنَ كَسْبِ الْقُلُوبِ وَكَسْرِ الْقُلُوبِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە هاوسەنگ بوون لە نێوان دڵ ڕاکێشان و دڵ شکاندندا، چونکە هاوسەنگ نەبوون لە نێوانیاندا ئیسلام دەشێوێنێت، واتە ئێمە نابێ لەبەر ڕاکێشانی دڵی کەسانێك حەقیقەت و ئیسلام بشوێنین یان حەق نەڵێین، وە هەروەها ناشبێت بە شێوازێك بین لەبەر دڵ شکانی هەندێ کەس حەقیقەت نەڵێین یان بیشێوێنین، واتە حەق و ئیسلام بگەیەنین، بەڵام ڕەچاوی هەموو شتە پێویستەکانیش بکەین.

## (٧٠) عَدَمُ التَّصَرُّفِ الْمَصْلَحِيِّ مَعَ النُّصُوصِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە مامەڵە نەکردن لەگەڵ دەقدا بە مامەڵەکردنێکی بەرژەوەندی خوازانە، واتە ئەو دەقەی لەبەرژەوەندیتە بیهێنی و بیبەی بەڵام ئەو دەقەی کە پێت وایە لەبەرژەوەندیت نییە ئاوڕی بەلادا نەدەیەوە و وازی لێبێنی. واتە بگەڕێی و بە ئارەزووی خۆت هەڵبژێری. ئوممەتی سەرکەوتوو دەبێ لەگەڵ دەقیشدا ڕاستگۆ بێت و دووڕوویی نەکات و بەرژەوەندی خوازانە نەبێت، کە وای لێهات ئیدی هەموو شتێك بە چاوێکی ماددی و مەسڵەحەت و بەرژەوەندییەوە دەبەسترێتەوە و ئوممەت لێك هەڵدەوەشێت.

## (٧١) الْاِتِّزَانُ وَالْوَاقِعِيَّةُ فِي الْفَتْوَى مَعَ مُرَاعَاةِ الزَّمانِ وَالْمَكَانِ وَمُسْتَجَدَّاتِ الْعَصْرِ

یەکێکی دیکە لە بنەماکان بریتییە لە پێداچونەوە بە فەتوادا و هاوسەنگی و واقیعی بوون تێیدا لەگەڵ ڕەچاوکردنی کات و شوێن و شتە نوێکانی سەردەم، چونکە فەتوا پەیوەندی هەیە بە تاك تاکی ئوممەتەوە، ئەگەر فەتواکان خوار بن بە دڵنیاییەوە ئەو ئوممەتەش خوار دەبێت، موفتی و مامۆستای وا هەیە هەتا فەتوای قورس

